

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **مێژووی دۆزەخ**
- **نووسینی:** جۆرجیس مینۆس
- **وەرگێڕانی:** هێمن مەهدی نەقشبەندی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** چیمەن
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٣) ساڵی ٢٠١٣ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨١٧)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەرۆك

# پێش خوێندنەوەی ئەم کتێبە

وەرگێڕان کاری ئاسان نییە، وەرگێڕانی کتێبێکیش کە بابەتەکەی تیۆلۆژی و ئایینی بێت، سەختییەکە چەند بەرابەر دەبێتەوە، چونکە پاشخانێکی دەوڵەمەندی گەرەکە لە زانین و کنەکردنی مەسەلە ئایینییەکان و رەوتێن جۆراوجۆری، بۆیە لە هەندێ شوێندا ناچاری بووە، کە لە وەرگێڕانی دەقاودەقی بچمە دەرەوە، بۆ ئەوەی باشتر و روونتر بیرۆکەی نووسینەکە بە خوێنەر بگەیەنم، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە دەقە یەکەمینەکەیدا نووسەر پێویستی بەوە نەبووە، پەراوێزەکان رێک بخات، لەسەر ئەو بنەمایەی خوێنەری فەرەنسی زمان و ئینگلیزی زمان، ئاگاداری و ناسیارییان لەگەڵ ناو و رەوتەکاتی تیۆلۆژیدا هەیە، بەتایبەتی لە ئایینی کریستیانی و جولەکە، هەروەک لە وەرگێرانە عەرەبییەکەشیدا حەقی خۆی وەرنەگرتووە و تەنانەت لە هەندێک دێڕدا، هەڵەی زۆر زەق هەبوو، کە سەیرە بەسەر وەرگێرە عەرەبییەکەیدا تێپەڕیوە، بەڵام ئەوانە بۆ خوێنەرێکی کوردی زمان پێویستی بە وردکردنەوەی زیاتر هەیە، بۆیە لە روونکردنەوەی پەراوێز و ناوەرۆکەکەیدا، پشت بە کۆمەڵێک سەرچاوە بەستراوە تا بیرۆکەیەکی باشتر بە خوێنەری کوردیی بدرێت.

مەسەلەیەکی دیکە لەم کتێبەدا کە پێویستە خوێنەر ئاگاداری بێت، بەکارهێنانی زمانەکەیەتی، کە لە هەندێک شوێندا رەچاوی ئەو رێسا و یاسا نوێیانە کراوە، کە لە زمانە جیهانییەکاندا باوە، بۆ نموونە کەمکردنەوەی هەندێ پیت لە وشەدا، لەوانە لەبری ئەوەی بنووسم(جارێک) نووسیومە(جارێ)، هاوکات لە رووی رێزمانییەوە لە

زۆر شوێندا پەنام بردۆتە بەر شێوەزاری کرمانجی باکوور بەتایبەتی لە (کۆ)دا، بۆ نموونە لە کرمانجی خواروو، بەزۆریی ئاوەڵناوەکان دەکرێنە (کۆ) لەبری (ناو) وەک (کتێبە پیرۆزەکان)، کە لە راستیدا دەبێت وشەی(کتێب) کۆ بێت نەک پیرۆز، ئەمە لە کرمانجی سەروو چارەسەر کراوە، هەروەها وەک سەرنجیشم داوە لە شێوەزاری کرمانجی خواروو بەتایبەتی لە گوندەکان و هەم لە شێوەزاری موکری و کوردانی رۆژاوا پاشگری(گەل) بەکاردێنن، بۆ نموونە(کوڕگەلێکی باش یاریدەیان داین) کە لەبری(کوڕە باشەکان یاریدەیان داین) بەکاردێ، ئەوەش یەکێکە لە هەڵەکانی زمانەوانی، کە شار زاڵی کردووە بەسەر زمانی کوردیدا. لە کرمانجی سەروودا بەخستنەسەری پاشگری(ێن) کێشەکە کۆتایی دێت و ئەو هەڵە زمانەوانییەشمان لە کۆڵ دەبێتەوە، بۆیە لە زۆر شوێندا پاشگری(ێن)م بەکارهێناوە، لەهەندێ شوێنیشدا گەڕاومەتەوە سەر گوتنە باوەکەی شێوەزاری کرمانجی خواروو، لەبەر یەک خاڵی سادە و ساکار، ئەویش ئەوەیە کە هێشتا بنکەیەکی ئەکادیمی و زمانەوانی کوردیی، بڕیاری لەسەر نەداوە کە کامیان ببێتە ستاندارد، هەرچەندە من لەلای خۆمەوە پاشگری(ێن) بە درووستتر دەزانم، لەگەڵ پاشگری(گەل) لەهەندێک رستەدا، لەبەرئەوەی لە زمانەکانی جیهانیشدا چ عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی، ناو دەکەنە کۆ، نەک ئاوەڵناو یان ئاوەڵفرمان، هیوادارم خوێنەری بەڕێز ئاگاداری ئەم سەرەتایە بێت، بەو ئومێدەی زمانەکەمان پێشکەوتنی زیاتر لەگەڵخۆی ئاوێتە بکات...

هێمن مەهدی نەقشبەندی
٢٠١٣

## دەربارەی نووسەری ئەم کتێبە:

جۆرجیس مینۆس لێکۆڵەری بواری مێژوو، لە ساڵی ١٩٤٦ لە فەرەنسا لەدایکبووە، دەرچووی قوتابخانەی مامۆستایانی باڵا بووە، یاریدەدەری پڕۆفیسۆر و دکتۆری بواری مێژووی سەردەمی کۆن بووە لە زانکۆی ساینت بروک تا ساڵی ٢٠٠٧. لە بواری خۆیدا خاوەنی چەندین کتێبی لێکۆڵینەوەی مێژووییە و وەرگێڕدراون بۆ زمانەکانی ئیسپانی و ئەڵمانی و ئینگلیزی. ئەم کتێبەشی کە ئێستا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، بۆ یەکەمینجار لە ساڵی ١٩٩١ بەزمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە، دواتر لە ساڵی ١٩٩٤ و ١٩٩٥ و ٢٠٠٥ چاپکراوەتەوە. ناونیشانی راستەقینەی ئەم کتێبە (historia de los infiernos) واتە مێژووی جیهانی ژێرەوە-یە، کە ئەم وشەیەی دوایی رەمزێک بووە بۆ دۆزەخ، وەک نووسەر خۆشی لە ناوەرۆکی ئەم کتێبەدا روونیکردۆتەوە. نووسەری ئەم کتێبە هێشتا لە بەرهەمەکانی بەردەوامە و دوایین بەرهەمیشی کە لە ٢٠١٣دا دەرچووە، بریتییە لە کتێبێک بەناوی( history of solitude & solitary) کە لە فەرەنسا بە چاپ گەیەنراوە.

## دەروازە

بیـــرۆکەی دۆزەخ یـــان جەهەنـــم، ســـیمای نەگـــۆڕی ســـەرجەم شارستانییەتەکانە، لە کۆنترین دەستنووسی مرۆڤدا، کە پەیوەست بێ بە چەمکگەلە ئـایینییە سـەرەتاییەکانەوە، باسـکراوە و دیتوومـانە هەروەک چۆن لەنێو کتێبی هـاوچەرخی بێباوەڕەکانیشـدا قسـەی لەسـەر کراوە و بەدیمـــانکـــردووە. دۆزەخ شـــوێنێ خەمـــاوی و نەگریســـە، دەکەوێـــتە دنیـاکەیترەوە، یـان دۆخـێ تەنگـانە و نـاهەموارە، لەدەسـپێکی ژیـانەوە بـــوونی هەبـــووە و لەگەڵیـــدا دەژیـــین. دۆزەخ بەپێـــی شارشـــتانییەتە جۆراوجۆرەکـان، فرەشـێوە و خۆگـونجێنە. هێنـدەی دێرینیـی مـرۆی هۆشمەند تەمەنی هەیە، دۆزەخ پەیوەستە بە دۆخە مرۆڤایەتییەکەوە، کە تێیـدا ئـازار و رکوکیـنە و دژبەخـود و ناتواناییەکـانی بەیەکدەگەن، هەروەک چۆن بەهەشـت لانەی ئومێد و شـادی و خواسـتی گەیشـتن بە بەختەوەرییەکانیەتی، جا دۆزەخ چ هەبێ یان نەبێ، بەسـتراوە بە سزا و قیـامەتەوە، چ هەرمـانی[1] بـێ یـان راگـوزەر[2]، ئـاوێنەیەکە بـۆ هەر شارســـتانییەتێ، کە لە چارەســـەرکردنی کێشـــە کۆمەڵایەتییەکانیـــدا سـەرکەوتوو نەبووە، یـاخود سـەرچاوەی تەمومژیـی و نادیارییەکـانە لە دۆخـــی مرۆییـــدا. هەرچەنـــدێ مـــرۆڤ لە شـــیکارکردنی گرێگـــۆڵە تایبەتییەکانیدا دەستەوسان بێ، دۆزەخێ لە خەیاڵدانیدا درووست دەبێ، تەواوتـرین نمـوونەیەکیش هەر لەسـەرەتاکانی مێـژووەوە، بەخەیـاڵی شارســـتانییەتەکاندا هـــاتبێ، ئەوپەڕی هیـــوابڕاوی و زۆرتـــرین

---

١ : هەتا هەتایی، ئەزەلی.

٢: ماوەیەکی یەکلانەکراوەیە و گواستنەوەیە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێتر.

میتۆدی[٣]لەخۆگرتبێ، باشترینیان دۆزەخی گاوریی(کریستیانیی)[*]بووە. ئەو جۆرە دۆزەخە خۆیلەخۆیدا ئازارێکی رەهایە، بەهۆی ورووژاندنی نائاسوودەیی ویژدان و دەرککردن بە هەتاهەتایی ئازارەکان، رۆح و پێنج هەستەکە کوێر دەکەنەوە. دۆزەخی گاوریی وێناکردنێکی لۆژیکانەی بێ چەندوچوونە لەنێو لۆژیکی ئەفلاتۆنیی نوێدا، تایبەتیشە بە تیاچووەکان[٤]، ئەم دۆزەخە دژ بەئاراستەی ئایینێکی فریادڕەسە، ئایینێک ئارەزوودارە بە رێزگرتنی ئازادی مرۆڤ، ئایینێک کە چارەنووسی ئەوانە دیاری دەکا، لە سەرچاوەی چاکەی رەها جودابوونەتەوە، ئیدی دانسقەیی و هێزدارییەکەی لێرەوەیە.

پێش دۆزەخی گاوریی بەماوەیەکی زۆر، هەندێ هزری ئایینی، ژیانی دنیاکەیتریان وا دێنایە بەر خەیاڵ، کەوا بێجگە لە تەواوکاریێ بۆ ژیانی سەرزەمینی لە شوێنێکیتری دیارینەکراو چیدیی نییە، لەوێ بارکەوتووەکانی[٥]ئەم سەرزەمینە، پێکی ئازار دەنۆشن. لەم دۆزەخە کە سازدراوە بۆ هەموو کەسێ، لەنێوان چاکەکاران و خراپەکاراندا چ جیاکاریی و جوداکردنەوەیەک نییە، بەڵکو درێژبۆوەیەکی خەماوییە بۆ چارەنووسی ژیانی زەمینی، هەریەک لەو دوو دەستەیە. گەشەی پلە بەپلەی ویژدانی ئەدەبی، وایکرد وردەوردە دۆزەخ تەنیا خراپەکاران

٣ : گرتنەبەری کۆمەڵێ رێوشوێنە لە بوارێکی تایبەتیدا، بەمەبەستی شیکردنەوە و کنەکردنی تیۆرەکان.

٤ : ئەوانەن کە لە رۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە و بەرەو دۆزەخ و ئازارەکانی بەڕێدەکرێن.

*: لەنێو کوردەواریدا ئەم وشەیە بەرامبەر بە کریستیانی بەکارهاتووە، تەنانەت لە شاری سلێمانی گەڕەکی کریستیان نشینەکان بە گەڕەکی گاوران ناسراوە، کە ئەم وشەیە پەیوەندی بە وشەی(کافر)ەوە نییە وەک هەندێک حەز دەکەن وای لێکبدەنەوە تا وشە ئینگلیزیەکە بەکاربێنن.

٥ : کەسانی کەساس و ئومێدبڕاو

بگرێتەوە، ئەمەش لە سەرەتادا کاتیی بوو، دواتر لەگەڵ کریستیانیدا بووە هەتاهەتایی.

قۆناغی هاوچەرخ نیمچە گەڕانەوەیەک بوو بۆ چەمکی سەرەتایی، لەلایەکەوە پاشەکشەی بیروباوەڕگەلی تەقلیدی و کڵێسا، بوونە ورووژاندنی گومان لەسەر دۆزەخی گاوریی، کە تەمومژاوی و ناڕاستەوخۆیی زیاتر زاڵ بوو بەسەر مانیفێستەکانی باوەڕی(ئیمان) فەرمیدا، لەلایەکی دیکەشەوە ڕێژەگەریی زانیارییەکان لەسەر چاکە و خراپە، جیاوازییەکانی نێوان دۆزەخ و بەهەشتی دەسڕییەوە، کە هەریەکە لەو دوانە(واتە بەهەشت و دۆزەخ) لەمیانی دیالیکتیکی تەمتوماندا[٦] شوێنی خۆیان لەسەر ئەم گۆی زەوییە گرتبوو. پێدەچوو دۆزەخ وەک یەکێ لە توخمەکانی بوون، بەهۆی کێشمەکێشی نێوان پێداویستییەکانی تاکەکەس و داخوازییەکانی کۆمەڵەوە، ژیانی تێدا بەڕێوە بچێ، هەر تاکەکەسێکی نێو ئەو خەڵکە کە دەکەوێتە نێوان پۆتکی[٧] خۆوەدیهێنان و بەرکەوتی[٨] گێچەڵییەکانی فشارە کۆمەڵایەتییەکان، وا دەبینێ کە هەڵگری دۆزەخێکی تایبەت بەخۆیەتی، ئیدی ئەمە بۆتە بابەتی تاوتوێکردنی دەروونناسان و لێکۆڵەرە سایکۆلۆژییەکان و کۆمەڵناسان و فەیلەسوفان،

---

٦: گفتوگۆ و راگۆڕینەوە لەسەر دۆزێک، کە دەشێت بە دوو ڕێگە پەی پێ ببرێ، یەکەمیان بەرێگەی ئەزموون، واتە پێشتر تاقیکرابێتەوە، یان پێکەوە گرێدانی چەمکگەلێکی جۆراوجۆر بێت بۆ گەیشتن بە واتایەکی راستەوخۆ، کە لەدواجاردا بڕیارێکی لێوە گەڵاڵە دەبێت و شوناس و واتایەک بەدەستەوە دەدات، بەڵام مردن بۆ خۆی شتێکە نە ئەزموونکراوە و نە پێکەوە گرێدراوی چەمکگەلێکیشە، بۆیە ئەو جەدەلیەتە کە لەسەری دەکرێت بە جەدەلیەتی تەمتومان ناودەبرێت.

٧ : چەکوش بەتایبەتی ئەوەی ئاسنگەر بەکاری دێنێ.

٨ :  سندان یان ئەو پارچەیە کە کانزای سارد یان گەرمکراوی دەخرێتەسەر و بە چەکوش لێیدەدرێ بۆ وەرگرتنی شێوەی داواکراو، یاخود بۆ راستکردنەوە و پانکردنەوەی.

که پێشــتر ئەمە تەنیــا کــاری تیۆلۆژیســتەکان[9] بــوو. مێــژووی دۆزەخ مێــژووی رووبەڕووبــوونەوەی چارەنووســە تــایبەتەکەی خــودی مــرۆڤە، چونکە وەک هەندێ لە هزرڤانانی پێشوو بۆی دەچن، مرۆڤ پەرۆشانە لەنێو خۆیدا هەڵگری دوو چارەنووسی دژیەکییە، بە نۆرە کارایان دەکا، یاخود پێکەوە وەگەڕیان دەخات. ئەمە ئەوەیە کە "میلتۆن"[10] لە سەدەی حەڤــدەدا لە(بەهەشــتی ونبــوو) نووســیویەتی و دەڵــێ" هــزر شــوێنە تــایبەتەکەیەتی، هەر نێو خــودی هــزر، دەتــوانێ وا لە دۆزەخ بکــات ببێتە بەهەشت و بەهەشتیش بە دۆزەخ".

---

٩ : لاهوتییەکان، تیۆلۆژیست زانستی بیروباوەڕەکانە کە پەیوەستن بە خوداوە، وەک بوونی و خودی و سیفاتی و بڕوا بە دەقە پیرۆزەکان و دەسەڵاتی کڵێسا، ئەم زانستە لای موسڵمانان بەناوێکیتر هەیە کە پێیدەڵێن(علم الکلام).

١٠: جۆن میلتۆن شاعیر و زانای ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدە لەدایکبووە و کەسایەتییەکی چالاک بووە لە دۆزە سیاسی و ئایینییەکاندا، لە لەندەن ژیاوە، یەکێ لە بەرهەمە ناودارەکانی-بەهەشتی بزربوو-ە، کە باسی چیرۆکی شەیتان و دابەزینی ئادەم و حەوا دەکات بۆ سەر گۆی زەوی.

## بەشی یەکەم
## دۆزەخ لە شارستانییەتە زارەکییەکاندا

بەپێچەوانەی خاوێنکار[١١](purgatory) کە داهێنانێکی هۆشمەندانەی تیۆلۆژیی کاتۆلیکییە و"ژاک لۆگۆف"[١٢] مێژووە پرشنگدارەکەی دارشتووە، پێدەچێ مەحاڵ بێ لانکەی سەرهەڵدانی دۆزەخ یان جەهەنم دیاری بکەین. گەر ئەو تێکستە سەرەتاییانەی باس لە دۆزەخ دەکەن، مێژوویان بۆ هەزارەی دووەمی پێش زایین بگەڕێتەوە، ڕەنگە سەردەمی پێش مێژوو، ئەم بیرۆکەیەی بەخەیاڵدا هاتبێ. لەدەوروبەری ٥٠٠٠ ساڵ پێش زایین، مۆمیاکردنی جەستەکان سەری هەڵداوە، بێگومان لەگەڵیشیدا باوەڕی بەردەوامبوونی ژیان لەدوای مردن، یاوەری ئەم کردەیە بووە، واتە"دۆزەخ" بەمانا باوەکەی ئەو شوێنە بووە، کە کاروچالاکییەکانی سەرزەمینی تێدا بەردەوام دەبێ. بەڵام بڕوای هەبوونی دۆزەخ لە سایەی ئەگەرێکدا، کە دەشێ یاسای ئەخلاقی و چەمکی بەرپرسیارێتی نەبووبن، هیچ بیرۆکەیەک لەبارەی پاداشت و سزاوە، یاوەری دۆزەخ نەبووە، تا ئێستاش چ بەڵگەیەک نییە رووخساری دۆزەخ لەدەورانی پێش مێژوودا دیاری بکات.

---

١١ : لە تێڕوانینی کریستانییەکاندا بەتایبەتی لای کاتۆلیکەکان، هەر کەسێک کە دەمرێت، گیانەکەی دەبرێتە شوێنێک، بۆ ماوەیەکی کاتی ئەشکەنجە دەدرێت، بەمەبەستی پاکبوونەوە لە گوناهەکان، ئەو شوێنە ناونراوە پاکژکار.

١٢ : مێژوونوسێکی ناوداری فەرەنسایە، کە پتر لەسەر ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست دەنووسێت.

لەدەورانێکی نزیک لە ئێمە، هەندێ شارستانییەت کە تەنیا پشتیان بە نەریتی زارەکی[١٣] بەستووە، بواری دۆزینەوەی بەشێ لە رووخساری بیروباوەڕەکانی سەردەمی کۆنمان لەبارەی دۆزەخەوە دەدەنێ. ئەم شارستانییەتانە کە لەرووی کات و شوێن و پێکهاتەی کۆمەڵایەتییانەوە، یەکجار لە یەکترییەوە دوورن، باس لە ژمارەیەکی زۆر لە دۆزەخی گەلێ لەیەکچوو دەکەن، وا قسەی لەسەر دەکەن، کە کۆمەڵە شوێنێکن بۆ نیشتەجێبوونی هەموو کەسێ، وا باوە کە جێیەکان خەماوین، کاروچالاکییەکانی زەمینی لەوێ بەشێوەی تارمایی بەردەوامن. ئەو رێگانەش کە دەچنەوە نێو دۆزەخەکان، وەک ئەزموونێکی مەشقکردن[١٤]، بە تەڵە و تۆڕ و داو چنراون. تیاچووەکان ئەوانەن لە ژیانی سەرزەمینیاندا یاخود لەساتەوەختی مردنیاندا، رێزیان بۆ سرووتەکان دانەناوە، ئەو سرووتانە کە پارێزەری یەکگرتوویی کۆمەڵایەتین، یان تیاچووەکان خەوشدارەکانن و ناسراون بە گوناهباریی، ئەمانە دەردەکرێنە دەرەوەی ژیانی ئاسایی، لەدۆزەخدا سزای ئاوارەبوونیان بۆ دەرەوەی کۆمەڵگە بەسەردا دەسەپێنرێ، چونکە رێزیان لە یاساکانی کۆمەڵگەی خۆیان نەگرتووە. بەڵام ئەوانیتر، خۆگونجێنەکان و تێکەڵبووەکان بە کۆمەڵگە، هەر لە ژیانی سەرزەمینیاندا بڕیار لەسەر چارەنووسیان دراوە، بۆیە بارودۆخیان لە دۆزەخدا ناگۆڕێ.

---

١٣ : مەبەستی نووسەر گێڕانەوەی دەماودەمی رووداوەکانە لەنێو خەڵکدا، کە پەنا نابەنە بەر نووسینەوەی رووداوەکان، بەڵکو نەوە لەدوای نەوە بۆ یەکتری دەگێڕنەوە و بەو جۆرە مێژوو دەگوازنەوە.

١٤: مەبەستی نووسەر، ئەو کۆسپ و کەندانەیە کە لەکاتی مەشقکردندا بۆ مەشقکار دادەنرێت، وەک بازدان لە شوێنێکی بەرز، یان سەرکەوتن بە بەرزاییەکدا.

### ١-  ئەفریقیای ڕەش:

وەرگرتنی هەندێ نموونە لەسەر میللەتانی نیشتەجێی پشت بیابان، ئەم خەیاڵدانە دووپاتدەکاتەوە. دۆزەخی هۆزی سیریر لە سەنیگال، دەکەوێتە هۆنۆلۆ لەناوجەرگەی زەوی، ئەوێ شوێنێکی شوومە و تێیدا مرۆڤ وردە وردە تواناکانی لەدەست دەدات. هۆزی دیولاس لەهەمان ناوچە، تێگەیشتنێ سەیری هەیە و پتر پابەندە بە بیرۆکەی مۆراڵییەوە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ ئاوێتەیەکە لە سێ بەش: بەشێکی چاکەکارە و بەشێکی خراپەکارە و ئەوی دیکەش نایاب. لەکاتی مردندا بەشە خراپەکە نامێنێ و بەشە نایابەکە بەرەو بەهەشت دەچێ، هەرچی بەشە چاکەکەشە دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ ژیان. چارەنووسێ کە چاوەڕێی مەرگ بکا، پەیوەست دەبێ بە ڕێژەی ئەم بەشانە بۆ یەکتری، گەر هاتوو بەشی خراپەکارەکە زاڵ بوو، ئەوا مرۆڤەکە بەیەکجاری کۆتایی دێ و نامێنێ.

لەدۆزەخدا زۆرجار ژیان وەک ئاوێنەیەک بۆ ژیانی سەرزەمینی بەردەوام دەبێ، واتە شەو دەبێتە ڕۆژ و ڕۆژیش بە شەو، چەپ و ڕاست پێچەوانە دەبنەوە. تێبینی کۆمەڵێ لە ئەفەرۆزی[١٥] تیاچوو دەکرێ، کە ئێستا لەوێ نیشتەجێن بێئەوەی چ سزایەک بدرێن، ئەوانە پەراوێزخراوەکانن لەهەمە چەشنە: شێتەکان، کەمئەندامانی جەستەیی و عەقڵیی، ئەو مردووانەی  لە دۆخێکی ناوازە یان گڵاویدا تیاچوون، ژنان لە وەختی زەیستانی، گەنجانی نەفام و فریوخواردوو و بێئەزموون، نوقمبووەکان، خۆکوژەکان، هەورە بروسکەپێکەوتووەکان، سەرگەردانەکان، ئەم هەموو جۆرانە لە گینیا لای میللەتی کیزیس، لە(وڵاتی شەڕەنگێزان) لە هەناوی تاریکیدا نیشتەجێ دەبن.

---

١٥ : ئەو کەسانەی کە لە کۆمەڵگە دەکرێنە دەرەوە، یان قێزەون و بێزراون.

سزا و بەرەڤانی خودا بەهەر ڕێگەیەک بێ، دادەبەزێتە سەر ئەوانەی لەگەڵ کۆمەڵدا ناگونجێن، گەر ئەوانە لەسەر زەوی گۆشەگیر بن، ئەوا بە ئەفەرۆزی لە بارەگای ئاسایی مردووەکان دەمێننەوە، بێئەوەی تووشی ئەشکەنجە و ئازار بێن.

## ٢- دۆزەخ لای شامانییەکان:

سرووتی شامانییەکان[١٦]، دەتوانێ ناوەرۆکی دۆزەخ، بەشێوەیەکی باشتر ئاشکرا بکا، ئەم سرووتانە بەشێوەیەکی تایبەتی بەهۆی کارەکانی(میرسیا ئیلیاد)[١٧]ەوە ناسران، دەکرێ لەنێو زۆر میللەتانی جۆراوجۆردا بەدی بکرێن، هەر لە لای میللەتە نیمچە کۆچەری و چیاییەکانی تبت و ئاڵتای و گینیای نوێ و مەنگۆلیاوە بیگرە تا دەگاتە هیندییەکانی ئەمریکای باکوور و هۆزەکانی تۆونگۆز و یوراک لە سیبیریای ناوەڕاست.

لەنێو ئەم میللەتانەدا کەسێک ئاگادارییەکی ڕاستەوخۆی لەبارەی دۆزەخەوە هەیە، ئەویش شامانی کاهینە، کە زانایی و پڕتفاقییەکەی بەتوانای تایبەتی، ڕێی دەدا لەمیانی قۆناغێک لەچلەکێشی[١٨]، کە ڕەنگە

---

١٦ : چەندین گرووپی ئایینین کە نیشتەجێی ئاسیای باکوور و ئەمریکای باکوورن، زیاتر بەکاری جادووگەری و پەیوەندیکردن بە ڕۆحەکانەوە سەرقاڵ بوون.

١٧ : میرچا ئەلیادە(١٩٠٧-١٩٨٦) نووسەر و مێژوونوسی بواری ئایینی و فەیلەسووف و ڕۆمانووسی ڕۆمانی، خاوەنی چەندین کتێب و نووسینە لە بواری ئەدەبی خەیاڵی و فەلسەفەی ئایینەکان.

١٨ : مانای خۆدوورخستنەوەیە لە چێژەکانی دنیا بۆ گەیشتن بە توانا ڕۆحییەکان، کە پتر لەنێو بوداییەکاندا پیادەکراوەو دواتر لەنێو پەیڕەوکارانی تەسەوف و تەریقەتەکانی ئیسلامدا پەنای بۆ براوە، لەڕێگەی خۆبرسیکردن و دوورکەوتنەوە لەهەر ئارەزوویەکی دنیایی بۆ ماوەی چل ڕۆژ، هەر لەبەرئەوەشە پێیدەگوترێت چلەکێشی یان خەڵوەتکێشان، کە ئەم وشەی دوایی زیاتر واتای تەنیابوون دەگەیەنێت.

سـێ ڕۆژ بخـایەنێ، بەشـێوەی ڕۆح بەرەو شانشـینی مردووەکـان شۆڕبێتەوە، تا یاوەریی گیانی مردووەکە بێ و یارمەتی بدات بۆ بڕینی ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی لەسەر ڕێی دانراون، لەکاتی گەڕانەوەشیدا پوختەیەک لەسەر گەشتەکەی باس دەکات و بەرچاوڕوونییەک لەسەر ئەزموونەکانی بە خەڵک دەدا.

بەمجـۆرە دەزانـین کە سـەفەری دۆزەخیـی، لای ئەم میللەتـانە، بەچەندین تەڵە چنراوە، زۆرترین شتێکیش کە لەم سەفەرانەدا دووبارە دەبنەوە، گوزەرکردنە بەسەر پردێکی زۆر باریکدا، کە زۆرجار دەبێتە تاڵە موویەک، بەسەر هەڵدێرێکی گەلێ قووڵدا دەڕوانێ، لەوێدا ئەوانە دەکەونە خوارەوە کە شارەزاییان کەمە. بەڵام ئەوانەی کەندوکۆسپەکان نابڕن، چارەنووسیان نادیارە. ئەمجۆرە کەسانە لای تەتەرەکان، ئەو ئازارانە دەچێژن کە شەیتانەکان وەک سزا بۆیان دیاریکردوون. سزاکە سزایەکی مۆراڵی نییە، بەڵکو مەسەلەی دووبارەکردنەوە و مەشقدانە. ئەوانەی سـەرگەردان دەبـن، زۆر کەساسـتر و نەزانتـر و دەبەنگتـرن لەوەی شەڕەنگێز بن. دەکرێ هەموو مرۆڤێ بگاتە دۆزەخ، گەر پشت بە ڕێبەرێکی زرنگ ببەستێ، هەر خودی خواوەندەکانیش بەخۆیان شامانی یەکەمیان بۆ ئەم ڕۆڵ بینینە ناردووە. لای تبتییەکان و هۆزەکانی مۆسۆ لە گریک(یۆنـان) نەخشـەیەک لەبەردەم مـردووەکەدا رادەخـرێ و دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی ڕێگەی دۆزەخی نیشان بدەن، کە بە نۆ شورا دەورە دراوە، چەنـد پـرد ئەم شـورایانە لێـکجـودا دەکـاتەوە، کە شەیتانەکان پاسەوانی دەکەن. پاش ئەوەی مردووەکە حەوت چیا لە ژێر دەبڕێ، دەگاتە لای درەختی تیماری نەمری[19] (tree medincine eternity).

---

١٩ : درەختی تیماری نەمری: مەبەستی نووسەر ئەو درەختەیە کە گوایە لە بەهەشتدایە و ئەوی لێی بخوات، بە نەمری دەگات، هاوکات ئاماژەیەکیشە بۆ ئەو ڕووەکەی کە گەلگامش

دەشێ ئەزموونەکانی گەشتەکە وەک قۆناغەکانی پاکبوونەوە دابنرێ. لای میللەتانی ئاڵتای دەبێ مرۆڤ دوورییەکی زۆر ببڕێ، بیابان و چیا و ئۆقیانووس و دەشتەکان تەی بکا، پێشئەوەی شۆڕبێتەوە بۆ نێو کونێک، کە دەیگەیەنێـــتە حەوت پلیکـــانە، ئەم پلیکانـــانە بەربەســـتن، یـــاخود پەداکەکـــانن[٢٠](pudaks) مـــۆرکێکی مەشـــقداری بەســـەریدا زاڵە. دواتـــر تووشـــی پـــردە بەناوبـــانگەکە دێ، دواجـــار بە کۆشـــکی ئەرلیـــک خـــانی پادشـــای دۆزەخ دەگـــا، کە ســـەگەل پاســـەوانیەتی. هەمـــان رێـــڕەو لای دانیشـــتووانی راســـتەقینەی ئوســـترالیا دەدۆزیـــنەوە، کە هەنـــدێ لە وێنەکانیان گوزارشت لە سەفەری رۆحەکان دەکەن، تەواوی رێگەکە بە کەنـــد و کۆســـپ تەنـــراوە. بەڵام یـــاکۆتی و مەنگـــۆلی و تـــورکە رۆژهەڵاتییەکان، سەفەرەکەیان ئاسانتر کردۆتەوە، بەوەی مردووەکانیـان باڵ بۆ فڕین بەکاردێنن.

لەنێـــو ئەم هەمـــوو میللەتـــانەدا، دۆزەخ تـــێکەڵ بە بەهەشـــت دەبـــێ. ئەوانەی دەگەنە دەڤەرە ژێرزەمینییەکـــان، کە شـــــوورا زەبەلاحەکـــان سنووریانە، سەرقاڵی کارە زەمینییەکانیانن، رێز لە پلەبەندیی کۆمەڵایەتی دەگرن. دۆخی مرۆڤ لە دنیاکەیتر، بەپێی پێگەیان لە ژیانی سەرزەمینی دیـاری دەکـرێ، تەواوی شـتگەلێ کە لەسـەر زەوی روودەدەن، لەوێـش بەهەمانشێوە دووبارە دەبنەوە. لە دۆزەخدا بەهێزەکان هەر بە هێزداریی خۆیـــان دەمێنـــنەوە. لای مـــیللەتە جەنگاوەرەکـــانی وەک مەنگۆلییەکـــان، کەســـــی مـــــردوو لەلایەن ئەوانەوە خـــزمەت دەکـــرێ، کە لە ژیـــانی

بەشوێنیدا وێڵ بوو بۆ ئەوەی نەمری بەدەست بێنێت، بەڵام پێش ئەوەی پێی بگات، مارێک خواردی و لەسەر ئەو بنەمایەش ئەو مارە بۆتە هێمایەک لە بواری پزیشکیدا کە لەدەوری جامێک پێچی خواردووە، وەک نیشانەیەک بۆ ساخڵەمییەکی نایاب.

٢٠ : ئاماژەیەکە بۆ بەربەستی یەک لەدوای یەک کە یاریزانان لەکاتی وەرزشی راکردندا بازی بەسەردا دەدەن.

سەرزەمینیدا کوشتوونی. لێرەش لە راستیدا بڕوایەکی گشتی لای تەواوی ئایینەکان هەیە، کە هەتا هەتایی لەسەر ئەم زەوییە، درووست-دەکرێ.

ناکۆکییەکان لەسەر پێوەرەکانی دیاریکردنی ئەو شتانەیە کە لەدوای گۆڕەوە دێنەئاراوە، لە سەرجەمی شارستانییەتە تەقلیدییەکاندا کە لەدۆخێکی ئابووری وادا ژیاون، زۆرجار راگوزەر[٢١] دەبن و بەهەموو جۆرە مەترسییەکی دەرەکی، دەکەونە ژێر هەڕەشەوە، رەگەزی یەکلاکەرەوە لێرەدا یەکبوون یان یەکگرتنی کۆمەڵە. پەراوێزخراوەکان ئەوانەی تێکەڵ نابن و لە پەیداکردنی بژێوی خەڵکدا بەشداری ناکەن، تەنیا ئەمانە دوور دەخرێنەوە و تەریک دەکرێن. بەڵام لای ئەسکیمۆکان بۆ نموونە، راوچییە سەرنەکەوتووەکان دەنێردرێن بۆ شوێنێکی ژێرزەوی، کە لەوێ بەدەست برسێتییەوە بناڵێنن، لەکاتێکدا ئەوانەی خۆیان کوشتووە، لەلایەن کۆمەڵەوە خۆکوشتنەکەیان بەهای قوربانیدانی تێدا دەخوێنرێتەوە، کە ئەمەش ئەوپەڕی ستایشکردن هەڵدەگرێ، بۆیە ئەمانە بۆ بەرزترین ئاسمان هەڵدەفڕن و لەگەڵ پاڵەوانەکاندا دەبن.

ئەوەی لە کۆمەڵ دەمێنێتەوە لە شوێنێکی بێلایەندا لە دۆزەخ کۆدەکرێنەوە، بێ هیچ جیاکارییەک، ئەمە بیروباوەڕی کۆنی میللەتانی ئاسیای ناوەڕاست بووە، کە گەڕیدە سەرەتاییەکانی ئایینی کریستیانیی سەرسام کردبوو، وەک گەڕیدەی فەرەنسی "ژان دی پلان کارپین" کە لە سەدەی هەژدەدا نووسیویەتی: ئەوانە هیچ شتێ لەبارەی ژیانی هەتاهەتایی و سزای هەتا هەتایی نازانن، بڕوایان وایە لەدوای ئەم ژیانە،

---

٢١ : مەبەستی نووسەر ئەو شارستانییەتانەیە کە دۆخی ئابوورییان لەسەر بناغەیەکی پتەو بونیاد نەنراوە و بەردەوام خۆیان بە کۆچەری دەزانن و خاوەن خاک و نیشتمانێکی دیاریکراو نین، زیاتر پشتیان بە دەوروبەری خۆیان بەستووە.

لەدنیـــایەکیتردا زینــدوو دەبــنەوە و لەوێ ژمارەیــان زیــاد دەکــاتەوە و دەخۆن و دەخۆنەوە و هـیچ کـارێ نـاکەن، تەنیـا و بەس ئەوە دەکەن، کە کاتێ لەم دنیایەدا زیندوو بوون و کردوویانە.

**٣- ئەمریکای پێش کۆڵۆمبس:**

لەپـێش گەشـتەکەی کۆڵـۆمبس، شـیاندنی کولتـووریی کـۆمەڵایەتی، کە نێردە کاتۆلیکەکان لە شارسـتانییەتە گەورەکانـدا ورووژانـدیان، کـارێکی کـرد، کە ناسـینی بیروباوەڕەکـانی پەیوەسـت بە دنیـاکەیتر، شـتێ مەحـاڵ بێـــت. ئەو بەڵگەنامـــانەش کە لەو ســـەردەمەدا کـــۆکراونەتەوە، لەژێـــر کاریگەرییەکی خەستی کریستیانیدابوون. بەوجۆرە گارسیلا کۆدوالا ڤیگا لە هۆزی ئانکا، بۆتە کریسـتیانی و لەدوا دواییەکانی ژیانیشـیدا کـراوەتە کاهین، ناوبراو جەختی لەسەر ئەوە کردبوویە، کە میللەتی ئانکا بڕوایـان بە بـــوونی دۆزەخێکـــی بەئـــازار هەیە بـــۆ شـــەڕەنگێزان. دەکـــرێ چەمـــکە هینــدییە راســـتەقینەکان شـــێوێنرابن، بەڵام وەک پێــدەچێ ئەم دۆزەخـــی ئانکایە بەهەر شێوەیەک بووبێ، کاتیی بووە.

ئانکـا بڕوایــان بەوەیە لەدوای ئەم ژیــانە، ژیــانێکیتر هەیە، ســزا بـۆ شـەڕەنگێزان و بەختەوەرییش بـۆ چاکەکـاران دێنـێ، ئەوان نـاوچەرگەی زەوی بە ئوکو پاچە(ucu pacha) ناودەبەن، واتە دنیای ژێرەوەی ساز و ئامادە و ماڵی شەڕەنگێزان، بەواتـایەکی باشـتر نـاوێکی دیکەیـان داوەتـێ، کوپایپا هواسین(cupaipa huacin) کە ماناکەی(ماڵی شـەیتان) دەگەیەنـێ. ئانکـا جەخـت لەوە دەکەنەوە ژیـان لە جیهـانی خـوارەوە، کە پێـی دەڵێین دۆزەخ، پـڕە لە هەمـوو نەخۆشـی و شـەڕێک کە لەم دنیـایە تووشـمان دەبـــێ، نە حەوانەوە هەیە و نە رەزامەنـــدی. ئەوان هەروا بڕوایـــان بە رۆژی قیامەتێکی سەرتاسەری هەیە، بێئەوەی خەیاڵیان بۆ نەمریی یان

نەهـامەتیی بچـێ، بەڵکـو وێنـای ژیانێکیـان کـردووە، هاوشـێوەی ژیـانی سەرزەویمانە، چونکە عەقڵیان لەم ژیانەی ئێستایان زیاتر، بڕی نەدەکرد.

لای(مایا) دۆزەخێک بۆ هەمووان لە ژێر زەویدا بەرپا کراوە، هیچ جۆرە سیستەمێکی باوەڕیی تێدا نییە. بەڵام چارەنووسی مردووەکان لای ئەزتیک[٢٢]، بەجۆرێکەوە نەوەستاوە و زیاتر فرەڕەنگە، ملکەچە بۆ جۆری مردنەکە، نەک بۆ لایەنی مۆراڵی، دۆزەخی ژێرزەوی لای ئەوان دەکەوێتە میتلان، لەوێ میکتلانتکۆهتلی(mictlantecuhtli) و هاوەڵەکەیمیکتلانسیهۆتلی(mictlancihuatli) فەرمانڕەوان. مردوو دوای سەفەرێکی سەخت و درێژ، ئەوانەی دەگەنە کۆتایی ئەم سەفەرە: جەنگاوەرەکانن کە لە شەڕەکاندا کوژران و دەچنە ناوچەی خۆرهەڵاتن، ئافرەتگەلێکن کە بەسەر سکەوە چوون و دەگەنە ناوچەی خۆرنەوازان، منداڵگەلێک کە بە کۆرپەیی مردوون و دەگەنە ناوچەیەک درەختەکان شێوەی مەمک دەگرن، نغرۆبوو و برووسکەپێکەوتووەکانیش لە ژینگەیەکی بەفەڕ و تەڕدا دەبن، کە پێیدەگوترێ تلالۆکان(tlalocan).

بەهۆی خۆسەپاندنی کریستیانی و یاسـاگەلی تیۆلـۆژی و مـۆراڵییەوە، ئەم چەمکـــانە ئـــاوەژوو بـــوونەوە. دۆمینیکـــی و یەســـوعییەکان[٢٣] دەســتیانکرد بە بڵاوکـردنەوەی ئەوەی، کە پـێش دۆزیـنەوەی ئەمریکـا، ســـەرلەبەری هینـدییەکان بـۆ هەتـا هەتـایە لە دۆزەخـی پـڕ ئـازار و

---

٢٢ : ئیمپراتۆریایەک بووە لە ساڵانی ١٤٢٨ تا ١٥٢١ فەرمانڕەوای وڵاتی مەکسیکی ئێستای کردووە و زۆر شاری گەورەیان بوونیاد ناوە، هەتا ئێستاش زۆرێ لە خانەوادەکانی مەکسیک دەچنەوە سەر ئەزتیک.

٢٣ : لەسەرەتای سەدەی سیانزە رێبازێک لە کریستیانی هاتەبوون، لەلایەن(عەبدو ئەلئەحەد) یان بە ئیسپانی کە پێیدەڵێن دۆمینگۆ دی گۆتمان و بە فەرەنسیش(دۆمنیک)، هەستا بە هێنانەبوونی رەبەنێتی دۆمنیکان کە سەرەتا لە ئافرەتانەوە دەستی پێکرد و دواتر لەساڵی ١٢١٦ برایانی دۆمنیک-یش هاتەئاراوە، کە پتر بایەخ بەلایەنی رۆحیی دەدەن.

ئەشکەنجەدا دەمێننەوە، چونکە ئەوانە ئاییینێکی راستەقینەیان نەزانیوە و نەناسیوە. کۆڕی لیما کە لەساڵی ١٥٥١ بەسترا، فەرمانی بە قەشەکاندا، کە هیندییەکان ئاگادار بکەنەوە، لەوەی( تەواوی نەوەکانی پێشوویان و دەسەڵاتدارانیان لە ئێستادا لەبەردەم بارەگای ئازار و ئەشکەنجەداندان، چونکە خودایان نەناسیوە و هەرگیزیش نەیانپەرستووە، بەڵکو خۆر و بەرد و بوونەوەری دیکەیان پەرستووە). ئەم بۆچوونە رووشکێنە، وررووژێنەری جەختکردنەوەیەک بوو، کە پاساو دەداتە ئەوەی( رزگاربوون، لە دەرەوەی کڵێسا، بوونی نییە). وتەزای رزگاربوون تەنیا لەدەستی کڵێسەدایە، وتوویژێکی توندی لەنێو خودی کڵێسادا خستەوە، بەهۆی هیندییەکانەوە ناوەندەکانی کریستیانی کەوتنە نێو شڵەژانێکی بەتینەوە. لەسەر دۆخی وڕێنەکردن و هاتنی وێنەی خەیاڵیی بەبەر مێشک و چاوی هیندییە مەکسیکییەکاندا، تۆژینەوەکان ئاشکرایانکرد، کە زیاد لەنیوەی ئەو دۆخە وڕێنەییانە یان سەرمەستییانە، پەیوەندیی پتەوی بە دۆزەخەوە هەیە. هەروەها پێکدادانی دوو شارستانییەکە، دوو ئاراستەی دژ بەیەکی لەنێوان دۆزەخی هەردوولادا روونکردەوە، دۆزەخێک کە تەقلیدییە و بێلایەنە و خۆگونجێنە لەگەڵ پێداویستییە زەمینییە بەدینەهاتووەکانی هەر کەسێ لەسەر زەوی، لەگەڵ دۆزەخە رەق و بێزارکارەکەی کریستیانیی.

**٤-دۆزەخی جێرمانی و ئەسکەندەناڤییەکان:**

هەمان جیاوازی لەدۆزەخی میللەتانی جێرمانی پێش کریستیانی و ئەوروپای باکووردا دەبینین. لێرەدا دەستەواژەکان گوزارشت لە دژەئاراستەیی دەکەن و لەهەمان کاتیشدا هاتنە ناوەوەی هەندێ سیمای بتپەرستیی لە چەمکە کریستیانییەکاندا ئاشکرا دەکا. دۆزەخی جێرمانیی بریتییە لە(هێڵ-hell-) یاخود(حەشارگە) جیهانێکی تاریکی ژێرەزەمینی،

سـارد و تەمێـک داپۆشـیوە، کە مردووەکـانی تێـدا بـزر دەبـێ. ئەم وشەیە(واتە هێڵ) بۆ ناونانی دۆزەخ لە زمانی ئینگلیزیدا بەکاردێ(Hell) لە ئەڵمانیشدا بۆتە وشـەی(Holl) کە زاراوەیەکی نزیکە لە وشـەی-کون یـان چـاڵ-(HoliیـانHohle )، لەکاتێکـدا کڵێسـا لە وڵاتە لاتینییەکانـدا وشـەی(Infernum)ی سـەپاندووە، کە بەمانـای دنیـای خـوارەوە یـان شوێنی خوارەوە دێت، هەروەها(Inferi)یش بەمانای دۆزەخی بتپەرستان دێ.

دۆزەخ لای جێرمانی و ئەسکەندەناڤیەکان شوێنێکی دووری داخراوە، گەیشتن بەو جێیە دەکرێ دوای سەفەرێکی دووری پڕ مەترسی بێتەدی، بەڵام زۆرینەی گەشتەکە دەریاییە. پێدەچێ پاش گۆڕانکارییەکی زۆر، جیاکـارییەک لەنێـوان چارەنووسـی مـردووە جۆراوجۆرەکانـدا ئەنجـام درابێ، رەنگە ئەوەش لەژێر کاریگەریی چەندین توخمی دەرەکیدا بووبێ. کۆمەڵە قەسـیدەیەکی کـۆن هەیە بەناوی(پێشـبینییەکانی پێغەمبەرێـک) وا دەگەیەنـێ کە بەرپـابوونی قیـامەت و سـزادان بەهـۆی هەڵە ئەنجامـدراوەکان، لەسـەر ئەم زەویـیە روودەدەن، بەڵام پیشـەی کـۆمەڵایەتیی هەر کەسـێ، پێـوەری سـەرەکییە لە دیـاریکردنی سـزاکاندا: ڤالهـالا(Walhalla) بارەگـای جەنگـاوەرە مردووەکـان، دەبێـتە کۆشـکێکی نایاب، جەنگاوەران بە یاوەری ئۆدین[٢٤] ئاهەنگی تێدا دەگێڕن و خوان دەڕازێننەوە. سەرکەوتنی دەستە سەربازییەکان پێشڤەچوونێکی بەخۆوە بینیـوە، کە لەدنیـاکەیتردا وا رێکخـراوە لەگەڵ مـۆراڵی جەنگییـدا یەک-بگرێتەوە.

---

٢٤ : لای جێرمانییەکـان ئەمە خواوەنـدی جەنـگە و بە زمـانی ئەڵمـانی پێیـدەڵێن ڤۆتـان کە جادووگەرێکی شامانییە.

چوونه نێو شانشینی مردووەکان لای ئەسکەندەناڤی و سلتییەکان[٢٥]، گەلێ ئاسانە و زۆرێ لە پاڵەوانە زیندووەکان، پاش سەفەرێکی پڕ لە تاقیکردنەوە و راهێنان، توانیویانە سەردانی بکەن، سەفەرکردن بۆ ژێرزەوی وەک ئەوەی هەردوو پاڵەوان(نەرا) و (کۆن) پێی هەستاون، هەروەها سەفەر بۆ پشت زەریاکانیش کە هەریەکە لە(بران) و(کۆنلا) و (ئۆیزن)و(کاچۆلین) ئەنجامیانداوە. ئەم نموونە دۆزەخییانە کە ئەفسانەکان درووستیدەکەن، شوێنی ئازار و ئەشکەنجە نین، بەڵکو بەبێ هیچ جیاکارییەکی مۆراڵی، تەواوی مردووەکانی تێدا نیشتەجێیە. لێرەدا سەیر لە ئولفەتگرتنی پەڕینەوەیە لەم جیهانەوە بۆ ئەویتر، کە ئەم ئاماژەیە لە دنیای سیلتیدا نەگۆڕە و هەتا ئێستاش لە ئەفسانەکانی گاورییدا بەردەوامە، وەک ئەوەی لە دۆخی هەردوو قەشەی پیرۆز براندان و پاتریک دەبینرێن. دەکرێ وا رووبدات پاڵەوانەکان بچن بۆ دۆزەخ بەمەبەستی گێڕانەوەی شتە بەنرخەکان، ئەمە وەک چارەنووسێک کە بەدوور نازانرێ.

هەروەک لە کۆنترین حەکایەتە میتۆلۆژییەکاندا[٢٦]هاتووە، پێدەچێ دۆزەخی ئەسکەندەناڤی زۆر لە دۆزەخی سیلتی ترسناکتر بێ. بەڵام دەکرێ وەک ئەو سەردان بکرێ، هەروەک چۆن هەندێ لە پاڵەوانانی وەک هادینگۆس و هەرمۆد گەشتیان بۆ ئەوێ کردووە بەئامانجی رزگارکردنی کەسانێ. ئەم سەفەرە راهێنانییە پەڕینەوەی پرد و رووبار لەخۆدەگرێ، دابەزین بۆ نۆ چینی ژێرزەوی و دۆزەخ کە لە چەقی زەویدایە و مانەوە تێیدا خەمۆکی و نەگبەتییە، بەڵام ئیتر ئەوە چارەنووسی هەموو کەسێکە.

---

٢٥ : مەبەست کریستیانەکانی دەوڵەتانی ئێرلەندا و ئایسلەندەیە.

٢٦: ئەفسانە.

ئەم زنجیـــــرە یەکەمیـــــنەی دۆزەخەکـــــان بەســــەر کـــۆمەڵگە هاوەڵگرەکاندا(واتە ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا پەیدا دەکەن) دەسـەپا، کە لە یەکگرتنێکـی پـتەودان لەگەڵ ژیـنگەی سروشـت و لە دۆخێکـی ئـابووری وادا دەژیـن، بەدەسـت ئاتـاجی و هەژارییەوە دەنـاڵێنن. هاوکـاری کۆمەڵ توخمێکی سەرەکی و گرنگە بۆ مانەوە، بەرێوشوێنی دەستەکۆیی پیادە دەبێ. بیرۆکەی رزگـاربوون یـان سـەرکۆنەکردنی تاکەکەسیی، بەمجۆرە سیسـتەمە نـامۆیە. ناشـکرێ چارەنووسـی تـاکەکەس لە چارەنووسـی تەواوی کۆمەڵ جودابکرێتەوە، هەروەک چۆن نـاکرێ ژیـان لە دنیـاکەیتر وا بێنـرێتە پـێشچـاو کە بە شـێوازیی جڤـاتی نیـیە. چەمکـی سـزادان لەمبـارەدا چ واتـایەکی نـامێنێ. کەواتە دۆزەخ شـوێنێکی بـێلایەنە، چـونکە کۆمەڵە کەسەکان بەهەمان ئەو کارانەوە سەرقاڵ دەبن، کە لەسەر زەوی پێوەی خەریـک بـوون، بەڵام ئەمجـارە لە پێگەیەکـی تاریـک و خەماویـدا دووبــــارەی دەکەنەوە، بەچـــــاوێکی رەشــــبینانەوە لە چارەنووســــی مردووەکان دەڕوانن بێئەوەی تووشـی سـزادانێکی تونـد ببنەوە. ئەوانەی لەم ژیـانە لە جڤـات دەکـرێنە دەرەوە، ئەوانەش کە بێسـوود بـوون بـۆ میللەت، هەروا ئەوانەی سرووتەکانی راهێنانیان لەسەر پیادەکردنی ئایین لەدەستداوە، چونکە ئەو سـرووتانە پێکەوەگرێدانی جڤات قـایمتر دەکـا، تەنیــا ئەوانەی لەســەرەوە ئاماژەیــان پــێدرا، تووشــی چارەنووســێکی تــایبەت دەبــنەوە، هەر ئەوانە قوربانیــانی ئاســتەنگەکانی ســەفەرن بــۆ بارەگای مردووان.

بیرۆکەی دۆزەخ وەک شوێنێ بۆ سزادان و ئەشکەنجە، تەنیا لەگەڵ شارسـتانییەتە گەورەکـانی رۆژهەڵاتـدا سـەری هەڵـدا و پەیـدا بـوو، کە خاوەنی یاسای تاکەکەسی و مۆراڵی پێشڤەچوون.

## بەشی دووەم

## دۆزەخ لە ئایینە دێرینە گەورەکانی رۆژهەڵاتدا

دۆزەخ بەمانای شوێنێ دێ، کە تێیدا هێزدارێکی لەڕادەبەدەر، لەپاش مردن هەڵدەستێ بە ئەشکەنجەدان و سزادانی ئەو کەسانەی یاسای مۆراڵییان پێشێلکردووە، لە هەموو ئایینە گەورە و جێگیر و سیستماتیکەکاندا، کە مرۆڤێکی تاکەکەس وەک نموونەیەک پێشکەش دەکات، تا شوێن پێی هەڵگیرێ، دۆزەخ لەوێدا بەپێی ئەم چەمکە، دەبێتە ئامرازێکی(چاکسازیی) بۆ ئەوانەی بەشێوەیەک لە شێوەکان، ژیانیان لەگەڵ ئەو نموونەیەدا یەکانگیر نەبووە، تارادەیەکیش هەمیشە پەیوەندییەک لەنێوان ئەو گوناهانەدا هەیە کە تاکەکان ئەنجامی دەدەن، لەگەڵ وێنەیەکی ئەشکەنجەدانەکە کە رووبەڕووی دەبنەوە و دەشێ ببێتە هۆکارێ بۆ پەشیمانبوونەوەیان و بگەڕێنەوە.

جیاوازیی سەرەکی لەنێوان ئەم دۆزەخە و سەرجەم ئەو دۆزەخانەی باسمانکردن، بوونی کریسیسە یان رۆژی حەشرە(لێپرسینەوە)، کە جڵەوەکەی لەدەستیخواوەنددایە. لە کاتێکدا دۆخەکانی یەکەم، تاکەکەس بەخۆی، خۆی گۆشەگیر دەکرد، بەڵام چارەنووسی تاکەکەس لێرەدا، مرۆڤە سەردارەکان دیاریی دەکەن، کارەکانی هەڵدەسەنگێنن بەو مەبەستەی تا چ ئاستێ لەگەڵ رێنماییەکانی تاکەنموونەکەدا یەکدەگرنەوە. ئەمە چەمکێکە پەیوەستە بە چەندین کۆمەڵگەوە کە بەزۆریی و بەشێوەیەکی بەرفراوان، پشت بەوە دەبەستن کارەکانیان بۆ دنیاکەیتر دوابخەن. بەشێوەیەکی گشتی پێدەچێ بیرۆکەی رۆژی لێپرسینەوەی

پـاش مەرگ، پەیوەسـت بـێ بە سـەرهەڵدانی چەمکـی دەوڵەتەوە، واتە سیستەمێکی سیاسی ڕێکخراو لە قۆناغی یەکەمیدا، پەیوەندییەکی پتەوی بە چەمـکە ئایینییەکـانەوە هەیە، کە دەبـنە تەواوکـار و بەهێـزکەر و بەجێگەیەنەری دەسـەڵاتی سیاسی. هەڵە و تاوانگەلێ کە دژ بە کۆمەڵگە ئەنجام دەدرێ، لە یەک کاتدا لەسەر زەوی، دەسـەڵاتی دادوەریی سزای بۆ داناوە، پاش مردنیش دادوەریی خواوەندیی بە پشت بەستن بەهەمان پێوەر سزای بۆ ئامادەکردووە. دەسـەڵاتی دووەم تەواوکاری دەسـەڵاتی یەکەمە، چـونکە هـیچ شـتێ لەژێـر دەسـتی دەربـاز نـابێ. هەردوو دادوەریـیـیەکە وەک یەک تەواوکـاری یەکتـرین، بەمانـای ئەوەی کە سیستەمی کۆمەڵایەتی لە سیستەمی جیهانیی جودا نابێتەوە: بردنەوە لە یەکەم مانای شپرزەییدانە بە دووەم، دادوەریی خواوەندییش تەواوکاری دادوەریی پادشایانە.

وا بـاوە لای ئـایینە گەورەکـانی ڕۆژهەڵات، کـات بەواتـا کـۆیی و گشـتییەکەی، چەمکێکـی وەرزیـی(دەوری)ی هەیە. بەواتـایەکیتر دۆزەخ کاتییە. کەسـە تیاچووەکان لە خولی خۆگۆڕینە[٢٧] گەورەکاندا، دووبارە دەگەڕێنـرێنەوە، دەرفەتێکـی نوێیـان لە ژیانـدا پێـدەدرێتەوە، کە زیـاتر خۆیـان لەگەڵ تـاکەنموونەکەدا بگـونجێنن. بەڵام لەنێـو ئەم هێڵکـارییە گەردوونییەدا،گـەلێ نـاکۆکی و لێکـدوورکەوتنەوەی ترسـناک سەرهەڵدەدات.

---

٢٧ : لای بوداییەکان بریتییە لە گواستنەوەی ڕۆح لە جەستەی مرۆڤەوە پاش مردنی بۆ جەستەی مرۆڤێکیتر، لە یۆنانی دێریندا هەریەکە لە ئەرستۆ و ئەفلۆتین پێیانوابووە کە گیانی مرۆڤ گەر چاکەکار نەبوویێت دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی پاش مردنی و دەچێتە نێو جەستەیەکیترەوە تا خاوێن دەبێتەوە لە شەڕەنگێزیی و پاش ئەو پاکبوونەوەیە، بەرەو نێرڤانا دەچێت. لە زمانی عەرەبیدا بەکۆپیکردنی گیانەکان(تناسخ الارواح) ناودەبرێت یان چوونە پێستێکی دیکەوە(التقمص).

## ١- دۆزەخی وڵاتی میزۆپۆتامیا

لەنێو کۆنترین تێکستی ئەدەبی جیهانییدا، کە لەسەر دۆزەخ بدوێ، تابلۆ ئەکەدییەکانە کە لە هەزارەی دووەمی پێش زایین نووسراون. ئەوانە گفتوگۆی نێوان گلگامشی پاڵەوان و ئەنکیدۆی هاوەڵی دەگێڕنەوە، کە گیانی لە دۆزەخەوە هەڵکشاوە. خەیاڵبینییەکان خەمگینن: رۆحەکان لە شوێنێکی تاریکی پڕ تەمومژدا سەرگەردان دەبن، ئەنکیدۆ نهێنییەکە دەدرکێنێ و دەڵێ:

" جەستەم کە بە شادییەوە دەستت پیادێنا، مۆرانە وەک کراسەکۆنی لێکردووە

جەستەم کە بە شادییەوە دەستت پیادێنا، تەژییە لە تەپوتۆز"

لەیەکەم سەرنجدا دۆزەخ وا دێتە پێشچاو، شوێنێکی گشتییە بۆ هەموو خەڵک، هەروەک چۆن لە شارستانییەتە زارەکییەکانی پێشوودا شوناس کرابوو. بەڵام گەر لە نزیکەوە تەماشای بکەین، بۆمان دەردەکەوێ هەندێ رۆح لە رۆحیتر داماوترە، لەوانە: نموونەکانی سەرەتا لە تیاچووەکان(edimmou) کە ئەو کەسانەن چارەنووسیان لەسەر ئەم زەوییە هەر کلۆڵی بووە، یاخود ئەوانەی لە یاسا دەرچوون، بۆ نموونە: ئەوانەی بەکارەساتێکی کوشندە تیاچوون، قوربانیانی جەنگ، ئەوانەی گۆڕێکیشیان بە نسیب نەبوو، ئەوانەی منداڵێکیان نەبوو تا ئاگاداری گۆڕەکانیان بن، نوقمبووەکان، ئەو ئافرەتانەی بەسەر سکەوە مردن، ئەو کچانەی بە پاکیزەیی گیانیان لەدەستدا، ژنە لەشفرۆشەکان کە بەهۆی نەخۆشییەوە سەریان نایەوە.

ئەم نموونانە لە تیاچووەکان ناخرێنە ژێر ئەشکەنجەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی رۆحی تووڕە و نائومێدن، تاڵی و نەهامەتییەکانیان دەبنە هاندەرێ، کە شەڕەنگێز و دوژمنکارانە بن، ئازاری یەکتری بدەن و

رەنگە هەندێجاریش بگەڕێنەوە بۆ زەوی و ژیان لە زیندووەکان تاڵ بکەن. بەو جۆرە ئەوانە لەدۆزەخدا جەللادی گیانی خۆیانن، چاودێریی دەخەنەسەر دۆزەخ و کەسێکی لێبەدەر ناکەن. ئەوە سزایەکی راستەقینەیە، چونکە باروودۆخی ئەم بوونەوەرە کڵۆڵانە بەهۆی دادوەرییەکی نەگۆڕەوەیە، کە تووشی نەزۆکی هاتوون و لە ژیاندان و رووبەڕووی کارەسات و نەخۆشی و هەژاریی بوونەتەوە، دادوەرییەکە بەهۆی کارە خراپ و شاراوەکانی خەڵک، خواوەند ئە شکەنجە و ئازارگەلێ بەسەریاندا دادەبارێنێ. هەندێ لە تابلۆ جادووییەکانی ئەکەدییەکان ئاشکرای دەکەن، کە ئەوانەی تووشی نەهامەتیەک دەبن، دەچن بۆ لای ئایندەگۆیەک[٢٨] تا لە هۆکاری کڵۆڵییەکان ئاگاداری بکاتەوە، ئیدی هەر ئەو کاتە دەکەونە بەر لێپرسینەوەیەکی ورد، ناوەرۆکەکەی هەر بەوانە دەچێ، کە لە پەڕاوی دانپێدانراوەکانی نێو ئایینی گاورییدا هەیە. ئەو تابلۆیانە باسی دەیان گوناهی تایبەتی و کاری پێشێلکاری مافی گشتی کردووە، کە دەکرێ هەندێکی نزیک بێ لە رێسا ناودارەکانی حەمورابییەوە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٥٠ی پێش زایین:

" ئایا قسەیەکی ئاژاوەگێڕیت کردووە، ئایا قسەیەکت کردووە، سووکایەتی پێکردن بوو بێ؟ ئایا شایانێکی(ترازوو) ساختەی بەکارهێناوە؟ئایا پارەی حەرامی خواردووە؟ ئایا سنووری زەوییەکەی خۆی بەزاندووە بۆ زەویی دراوسێکەی؟ ئایا بەدزییەوە چۆتە ماڵی خزمەکانی؟ ئایا دەستدرێژیی ناموسی کردۆتەسەر خێزانی خزمەکەی؟ ئایا خزمی خۆی کوشتووە؟ ئایا بەلای سەرشانی مرۆڤێکی سووک نەکردووە، کە بەدەست نارەحەتییەوە بناڵێنێ؟ ئایا کەسێکی باشی لە

---

٢٨: ئەو کەسەیە کە پێشبینی دەکات و پاشەڕۆژ دەبینێ.

خێزانەکەی دەرکردووە؟ ئایا خێزانێکی کۆی پەرتوبڵاو کردووە؟ ئایا لەدەسەڵات یاخی بووە؟ ئایا زمانی راستگۆ و دڵی درۆزن بووە؟ ئایا رێگەی خراپەی گرتۆتەبەر؟ ئایا سنووری دادوەریی شکاندووە؟ ئایا کارێکی کردووە باش نەبێ؟"

لەپشت ئەم وەگۆهێنانە بیرۆکەیەک هەیە، کە ناوەرۆکەکەی ئەوەیە، هەرکەسێ دژ بە یاسای کۆمەڵایەتی بوەستێتەوە کە پادشا دایڕشتووە، سیستەمی خواوەندیی گەردوونی پێشێل دەکا. لەم ژیانەدا سزا دەستبەرداری نابێ و بەکۆڵییەوە دەبێ تا دوای مردنیش، بەوەی رووبەڕووی چارەنووسێکی کلۆڵانە دەبێتەوە. گۆرانییەکی بابلی هەیە دەڵێت: من هەڵەم، لەبەرئەوەیە من نەخۆشم. گەر ئایندەگۆ لێخۆشبوون بۆ گوناهەکانی بەدەست نەهێنێ، ئەوا قیامەت لەسەر گوناهکارە کلۆڵەکە هەڵدەستێ.

هەندێ لە ئەفسانە سۆمەری و ئەکەدییەکان کە بۆ یەک چاخ و سەردەم دەگەڕێنەوە، وا نیشان دەدەن رۆحەکان لەکاتی مردندا، بەئاشکرا لەبەردەم خواوەندا دەوەستن. بەو جۆرە خواوەندی ئینانای سۆمەرییەکان(لای ئەکەدییەکان عەشتارە) بۆ ئەوەی بچێتە سەردانی دۆزەخ، کە ئێرشکیگال-ی خوشکی فەرمانڕەوایی دەکات، دەبێ بە حەوت دەرگادا تێپەڕێ، کە لە هەریەکەیاندا کراسێک لە کراسەکانی دەدڕێنێ، لەدواجاردا بەڕووتی دەگاتە ئەوێ. ئەوەی چاوی دەکەوێتە سەری، شادی بەخش نییە:" تەمومژ و تەپوتۆز چارەنووسیانە، قوڕە سوورە خۆراکیانە، رۆشنایی نابینن، بەڵکو لە تاریکیدا دەژین، وەک باڵندەکان خۆیان دەپۆشن، باڵەکانیان پێخەفیانە، دەرگا و کلۆمەکە تەپوتۆز دایپۆشیون" رۆحە باڵدارەکان بە قوڕ سواغدراون، ئومێدی هەڵاتنیان نییە. حەوت شورای زەبەلاح دەوراندەوری دۆزەخی داوە.

سەردەمی ئاشووری تۆقێنەرترین دیمەنی دۆزەخ دەخاتەڕوو. لە خەونی شازادە کەمما(Kumma) لە سەدەی هەشتی پێش زایین، شانشینی ئێرشکیگال وا دیارە کە پڕە لە دەعەجانی خواوەندیی: نیوە پیاو و نیوە ئاژەڵ. ئەو مەسەلەیە بە پاشەکشەی بارودۆخی ژیان لە دنیاکەیتر دادەنرێ، کە دەکرێ پەیوەست بکرێتەوە بە هەڕەمەکییەکی گەشەسەندوو، لە مۆراڵی دادوەری و جەنگاوەرانی ئەو سەردەمە.

**٢- دۆزەخی میسري:**

میتۆلۆژیای میسری یەکێکە لە دەوڵەمەندترین میتۆلۆژییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، درێژبوونەوە و بەردەوامی ئەم شارستانییەتە بۆ چەندین هەزار ساڵ و دیتنەوەی هەزاران تێکست و وێنەی بەجێماو، بوارمان دەدا تا رادەیەک بەوردی شوێن پێی چەمکەکانی تایبەت بە دۆزەخ، لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین هەڵگرین. میسرییەکان بایەخێ گەورە بە چارەنووسی"گیان" دەدەن، کە لای هەموو مرۆڤێ بەشێوەی دوانەیی (دوالیزمی) بەرجەستە دەبێ، پاش مردن هەڵدەستێ بە سەفەرێ درێژ، بە ناوچە سەیر و نامۆکاندا گوزەر دەکا، زۆرجار لەسەر کفنە بەردینە نەخشەکەی دەکێشرێ، دواتر دەگاتە شوێنی حەشرەکەی، کە سرووتە وردەکانی زۆرجار بەشێوەی دیواربەندی نمایش دەکرێن. ئەم بابەتە ئەگەرێ دەخاتەروو، کە لە ناوەرۆکیدا هەڵگری جیاوازییەکی روونە لەنێوان چاکە و خراپەدا، نزیکە لەوەی لە شارستانییەتەکانی میزۆپۆتامیا پێیان ئاشنابووین. لیستی کارە خراپەکان کە لە دانراوە ناودارەکەی(پەڕاوی مردووەکان)[٢٩] لەسەر کفنە بەردینەکان دانراون،

---

٢٩: کۆنترین کتێبی شارستانییەتی فیرعەونەکانە و لە سەردەمی بونیاتنانی هەرەمی گەورەدا نووسراوە، کتێبەکە چەندین بانگەواز و سروود لەخۆ دەگرێت، کە تایبەتە بە کەسی مردوو، بۆ ئەوەی لە گەشتە پڕ کەندوکۆسپەکەیدا سوودی لێوەربگرێ.

لەسـەر کـۆمەڵگەیەک کـورتکراوەتەوە، کە کـاری چـاکە تێیـدا بەنـدە بەڕێزگرتنی ڕێساکانی کاری کشتوکاڵییەوە وەک ئاودێری و سنووری موڵکەکان و ئەرکەکانی کۆیلە و پەرستنی خواوەند و مردووەکان: " چ ساختەچێتییەکم دژی هیچ مرۆڤێ نەکردووە، نەبوومەتە هۆی بێزاریی بێوەژنێ، لەبەردەم دادگەدا درۆ بە زارمدا نەهاتووە، بە بیروباوەڕێکی گەندەڵ ئاشنا نەبووم، لە ڕۆژێکدا زیاتر لە کاری خۆی، بێگاریم بەسەر سەرکاردا نەسەپاندووە، فەرامۆش نەبووم، ڕووینەداوە بێکار بووبم، هیچ یەکێ لە پیرۆزییەکانم هەتک نەکردووە، سکاڵام لەسەر دیلێک نەگەیاندۆتە لای گەورەکەی، کەسم برسی نەکردووە، کەسیشم نەگریاندووە، کەسم نەکوشتووە، کفن و خواردەمەنی مردووەکانم نەدزیوە، زەویم داگیر نەکردووە، شیرم لەدەمی کۆرپە نەگرتۆتەوە، هیچ جۆگەیەکم دانەخستووە".

خوێندنەوەی ئەم دەقە لەلایەن مردووەوە بەرامبەر ٤٢ بەرەڤان لە دادگەی ئۆزیریس[٣٠]دا چ دەگەیەنێ، پاشئەوەی ئەنۆبیس[٣١] دڵی دەکێشێ و توتیش[٣٢] ئاکامەکەی دەخوێنێتەوە؟ بۆچوونی زانایانی میسر لەسەر ئەم بابەتانە کۆنەکراونەتەوە، بەڵام ڕەنگە ڕەوا بێ، بابەتەکە پەیوەندی بە پاکژکردنەوەیەکی سرووتیانە بێ، بەشێوەی تەلیسمێ بێ بۆ وەدەرنانی هەموو جۆرە خراپەکارییەک. چارەنووسی ئەو مردووانەی بە تەواوی ملکەچی دەسەڵاتی خراپە بوون، بریتییە لە"مەرگی دووەم". لە ئەنجامی ئەوەدا بە تیاچووەکان دەڵێن(مردوو) لەبەرانبەر(

---

٣٠: خواوەندی ژیاندنەوە و لێپرسینەوە، لای میسریەکانی کۆن ئەو سەرۆکی دادگای مردووەکانە.

٣١: ناوێکی یۆنانی کۆنە دابڕاوە بەسەر خواوەندی مردوواندا، لە میتۆلۆژیای میسریدا شێوەی کەسێکی هەیە کە کەللەسەری سەگی هەیە.

٣٢ : خواوەندی زانستەکان و ئەدەبیات و کات لە میسری کۆندا.

ڕۆشنبۆوەکان) کە ڕوو دەکەنە شانشینی ئۆزیریس. ڕێسای ئەم مردنەی دووەم یەکلایی نەکراوەتەوە، زۆرجار خراپەکاران دەخزێنرێنە شوێنە تەسک و تاریکەکانەوە، کە تەژییە لە بۆگەنێکی تاقەت پڕووکێن" پاشەڕۆکی خۆیان دەخۆن، میزی خۆیان دەخۆنەوە، لەسەر کەللەی سەر دەڕۆن، تا نیشانی بدەن کە سیستەمی گەردوونیان سەرەوژێر کردۆتەوە" زۆرجار تیاچووەکان دەخرێنە ژێر ئەشکەنجەوە، کە مەبەست تێکشکاندنی کەسەکەیە و گۆڕینیەتی بۆ هیچ، بەشەکانی جەستەی لە قازاندا دەکوڵێنرێ و مارەکان دەیسوتێنن، کە لەدەمیانەوە گڕ دەردەچێ، فڕێیان‌دەدەنە نێو دەریاچەکانی ئاگرەوە، بەشەکانیتری جەستەی، ئەمیت(Ammit)پەلاماری دەدا، کە ئاژەڵێکی دەعەجانییە، جەستەی شێر و سەری تیمساحە. دڕندانە پەلاماری کەسەکە دەدا: جەستەی، سێبەری، گیانی(پڕەنسیپی ڕۆحی)، تەواوی ئەم وەحشەتناکانە لە(زۆنی لەناوبردن) لە جیهانی ژێرزەمیندا بەرێوە دەچن.

کەواتە ئازارەکان بۆ هەتا هەتایی نین، مەبەستەکە سزادان نییە، بەڵکو قڕکردنی ئەوانەیە، کە برەو بە هێزی ئاژاوەگێڕیی لە گەردووندا دەدەن، ئەوانەش کە کردەوەی خراپیان بەرامبەر سیستەمی کۆمەڵایەتی و گەردوونی ئەنجامداوە. زۆرجار تێڕوانینێک گەڵاڵە دەبێ، کە شێوازی کەرتوپەرتکردن و داڕووخان، کۆتایی بۆ نییە، وەک ئەوەی شەڕەنگێزی و خراپە لە تەفروتونابوون یاخی بووبێ. هەندێ لە فۆڕمەکانی ئەشکەنجەدان لای میسرییەکان، خزاوەتە نێو خەیاڵدانە سەرەتاییەکانی دۆزەخی گاورییەوە، کە رووخساری هەتاهەتایی و نەمریی وەردەگرێ.

### ٣- دۆزەخی هیندۆسی:

تێڕوانینی هیندی بۆ دۆزەخ، پێشڤەچوونێکی بەخۆوە بینی، لە شوێنێ کە نشینگەی هەموان بێ، گۆڕا بۆ سزادانێ لە جۆرێکی مۆراڵی. لە سەردەمی ڤیدی[٣٣]، لە هەزارەی دووەمی پێش زایین، مردووەکان بەبێ جیاکاری لە شوێنێکی ژێرزەمیندا بەناوی کارتا(Karta واتە کون) و ڤاڤرا(Vavraواتە زیندان) یان پارشانا(واتە هەڵدێر) نیشتەجێدەکران. بوونەوەرەکان خاوەن بوونێکی تارمایی ئاسای خەمبارن، هەستدارییان پێوە دیار نییە. جیاوازی یەکەم لە ریگ ڤیدا(Reg Veda) و ئەتارنا ڤیدا(Atharna Veda)دا زەق دەبێتەوە، کە هەموو ئەوانەی هەڵنابژێردرێن، بەرەو شانشینی یاما(Yama) سەرگەورەی دۆزەخ دەچن، کە ئیدی لەوێ دۆخیان ناهەموار دەبێ. کاتێکیش دەستەواژەی ناراکا(Naraka)واتە دۆزەخ سەری هەڵدا، بە مانای شوێنی ئەشکەنجەدان و سزادان هات.

لە تێکستەکانی برامانا(Bramana) و کارەکانی چاکەخواز شانکارا(Shankara) لە سەدەی هەشتەمی پێش زایین، وا هاتووە دۆزەخ لەگەڵ بەهەشتدا دژ بە یەکترین، بەشێوەیەک لەگەڵ ئەو جیاکارییەدا بگونجێ، کە لەنێوان هەڵبژێردراوەکان و تیاچووەکاندا هەیە. لێرەدا کرۆکی ئاڵۆزییەکە لەسەر سامسارایە(Samsara) یاخود گەشتی رۆح لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکیتر، ماتوڵ هێشتا نەگەیشتۆتە نێرڤانا کە دۆخی خۆشحاڵی کۆتاییە. لە باوەڕی هیندۆسی بەتایبەت لەهەمبەر دنیاکەیتر، نابێ چاوەڕوانی لۆژیکێکی توند بکرێ، هیندۆسی ئایینێکە لە

---

٣٣ : کرۆکی عەقیدەی هیندۆسییە و چەندین دەقی پیرۆز لەخۆدەگرێت، لای میللەتانی ئاریایی بۆ ستایشکردنی خواوەند و لە ناميلكەگەلێکی دەستخەتیدا نووسراونەتەوە و گوزارشت لە قوربانیدان و تێڕامانی فەلسەفی دەکەن.

زنجیــره ئەفســانەیەکی بەیەکەوە بەســتراو پێکهــاتووە، نە خــاوەنی دیکتــرینێکە[٣٤]، نە ئـاینزایەکی تـۆکمەش. بەوجـۆرە دۆزەخ و سامســارا، دوو دەستەواژەی جیاوازن، بەڵام یەک مانا دەبەخشن.

شــەڕەنگێز و خراپەکـار ئەو کەســەیە کە ئارەزوومەنـدە بە ژیـانێکی تـایبەت، تەنیـا بـۆ خـۆی و خـۆی بەســەریدا زاڵ دەبـێ، هەوڵـدەدا لەم دنیایەدا سامان و نەمری وەک دەستکەوتێکی تایبەتی بەدەست بێنێ. ئەو کەســەیە کە خۆپەرستی لەنێویـدا خـۆی پـێچ دەدا، لە(من)ـەکەیدا پەنـگ دەخـواتەوە، شـوێن خەیـاڵێ پـووچ دەکەوێ، تونـد دەسـتی لە ژیـان گیـر دەکـا، لە کاتێکـدا ژیـان فێـڵ و نەهـامەتییە. خراپەکـار دەچێـتە پێسـتی بـوونەوەرێکی نزمتـر و مـاددیتـر و چـاوچنۆکـتـر، یـاخود رەنـگە پـێش- ئەوەی بڕواتە پێستیەوە، بچێتە دۆزەخ، گەر خودی خۆشـی نەشـچێ ئەوا قەرینەکەی(کــۆپییەکەی) دەڕوات: ســێبەرە کڵــۆڵەکەی پریتــا(Preta)" جەســتەی ئــازار" کە بەخێرایــی رەشــەبا بەرەو شانشــینی یامــا شۆڕدەبێتەوە. سـەفەرە درێژەکە بڕینـی چەنـدین زۆنگـاو و چۆڵەوانی و رووبـاری ڤـایتـارانە لەخـۆدەگرێ، کە ئـاوێتەیەکە لە خـوێن و کیم و میـز. لەوێــدا خواوەنــد ســیتراگوپتا(Citragoupta) تۆمــاری کــارە بــاش و خراپەکـانی بـۆ دەخـوێنێتەوە، گەر کـارە خراپەکـان سـەنگینتر بـوون، ئەوا دەچێ بۆ ناراکا، بۆ دۆزەخ.

لەوێ بۆ گوناهەکانی خۆی و بەپێی رادەی ترسناکییان، سزای شیاو وەردەگرێ. سزای تـایبەت بۆ هەر کەسـێ، بێبەزەییەکی لەرادەبەدەری تێدا پەیڕەو دەکرێ، هونەرکـارییەکی سەرسـامکارانەیە: هەژارەکە پـارچە پـارچە دەکەن، دایـدەڕزێنن، دەیهـاڕن، دەیبـڕنەوە، کونـاودەری دەکەن، ونجڕ ونجڕی دەکەن، دەیبرژێنن، بەقـامچی لێیدەدرێ و دواتـر دەیـخەنە

---

٣٤ : عەقیدە.

پێستێکی‌ترەوە[٣٥]. دۆزەخ لە چەند خانەیەکی تایبەت پێکهاتووە بۆ دەیان ملیــــۆن کەس، هەروەک هەنــــدێ تێکســــت دەیگێــــڕنەوە. بەپێــــی پۆرانـا(Pourana) حەوت دۆزەخــی ســەرەکی هەیە، یەک بەدوای یەکـدا قووڵتر دەبن و دابەش‌دەبن بۆ چەند دۆزەخێکی لاوەکی، یەکێکیان پێی-دەگوترێ ئەسیپاتراڤانا(Asipattravana) واتە دارستانی گەڵا شمشێریی، دارستانێکە پەلی گەڵای درەختەکانی تیژە، بەر هەر تیاچوویەک دەکەوێ، برین و قڵیشی زۆری تێدەکا، شـەل‌وکوتی دەکا و خوار دەبێ و لەسـەر خۆڵەمێشـێکی گەرم دەکەوێ، ئەوجـا سـەگە دڕنـدەکان پـارچە پـارچەی دەکەن.

ئەم ئازار و ئەشکەنجانەی تیاچوو دەیچێژێ، سنوور و کۆتـایی هەیە، چــونکە هەمیشــە پــارچەیەک لە خواوەنــدی کارمــان(Karman)ی تێـدا دەمێنێتەوە، کە یاریدەی دەدا بۆ ژیانێکی نوێ، بەوەی خۆی رادەستی چڵێسییەکانی ژیان ناکا.

ئـایینە گەورەکـان لە رۆژهەڵاتـی دوور لەگەڵ هەندێ دۆخـی تایبەتدا، ئەم هێڵکـارییە گشـتییەیان گرتـۆتەبەر. دۆزەخــی بـودایی هەژدە بەشــی سەرما و گەرما لە خۆدەگرێ. ئایینەکانی چین باس لە نۆ دۆزەخ دەکەن، لە ژاپۆن ئەو کتێبە دەستدەکەوێ، کە ئاماری کارە خراپەکان و سـەنگی رۆحەکانی تێدا دەنووسرێتەوە. تیاچووەکـان یەکتری دەکوژن، دەهـاڕن، ونجڕونجڕ و یەکتری نغرۆ دەکەن.

بــێجگە لەو وردەکــارییە فۆتــۆگرافییە کە لەنــاوجەرگەی خەڵــکەوە هــاتووە، تەواوی ئەم دۆزەخــانە یەک واتــا و مەبەســتی هەیە، ئەویــش ئەوەیە، هەر کەســێ خــراپە هەڵبژێـرێ، سیســتەمی گەردوونــی خــودایی دەڕووخێنێ و لەدواجاردا چارەنووسـێکی پەشـێوی پڕ ئـازار بـۆ خـۆی

---

٣٥ : مەبەست لە(تقمص)ـە.

مسۆگەر دەکا. لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا خراپە ئاژاوەیە، ئاژاوەش ئازار و ئەشـــــکەنجەیە، هەر ئەمەیە لە دەوروبەری ســـــاڵی ٦٠٠ی پـــــێش زایین(لاوتسۆ)[٣٦] قسـەی لەبارەوە دەکا( ئەوەی بە چاکە بێتە پێشـەوە، چاکە پێشـوازیی لێدەکـا، ئەویشـی بەخـراپە هەنگـاو بنێ، خـراپە بەرەو رووی دەڕوات).

**٤- دۆزەخی مەزدەکی:**

ئایینە کۆنەکانی ئێران، خاوەن دنیـابینییەکی دوالیـزمین بۆ جیهـان، کە تێیـــدا هێزەکـــانی چـــاکە و خـــراپە لە کێشمەکێشـــدان. بەپێـــی ئەو بیروبـاوەڕانەی کە دەکـرێ بیـانگێڕینەوە بـۆ سـەدەی حەوتـی پـێش ئەم سەردەمەمان، رۆح پاش مردن سەرقاڵی سەفەرە تەقلیدییەکەی خۆیەتی، کە تـا رادەیەک لەهەمـوو ئایینەکانـدا دووبـارەبۆتەوە، سـەفەر لەرێـگەی هەسارەکانی ئاسمان و مانگ و خۆرەوە، یاخود سـەفەرێکی زەمینی بە سەرپەرشتی کچێک و دوو سـەگ. رۆح لەوێدا دەگاتە پردێک کە لێیەوە دەچێتە شانشینی ئاهورامەزدا، واتە دنیای ئاسمانیی. ئەم پردە بریتییە لە شمشـێرێ، چاکەکـار بەسـەر رووە پانەکەیدا دەپەڕێـتەوە، خراپەکـاریش بەسەر رووە تیژەکەیدا، ئیدی بەپێی یەکێ لە تێکستە پیرۆزەکـان" رێ لە رۆح دەگرێ، سەرەتا لەسەر پردەکە کەللەسەری دەکەوێتە خـوارەوە بـۆ دۆزەخ و سزای گونجاوی خۆی وەردەگرێ".

لێرەدا بەواتـایەکیتر جیـاکردنەوەی نێـوان چاکەکـاران و خراپەکـاران روویـدا، ئەم دیـمەنە بەشـێوەیەکی زەق، یەکـێ لە گەورەتـرین مـرۆڤە چـاکەخوازە ئایینییەکـان جەختـی لەسـەر دەکـاتەوە، کە کاهینێـک بـوو لە

---

٣٦:پیتۆڵ و فەیلەسووفێکی چینی بووە لە ساڵی ٣٢٠ی پێش زایین ژیاوە، دانەر و دارێژەری بنەماکانی ئایینی تاوییە، کە بە مانای رێگە دێت و لەمیانی کتێبێکدا دایڕشتووە، هەتا ئێستاش لەباشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا شوێنکەوتەی ئەو ئایینە هەن.

سەدەی حەوتی پێش زایین، زۆرجار بە خراپ لێی حاڵی بوون، ئەویش زاراتۆسترا یان زەردەشت بووە. لە دەقەکانی(ئاڤێستا) باس لە ئاینزاکەی(مەزدەکی) کراوە. گەر نەشتوانرێ بە تەواوی هەموو شتێکی بدرێتە پاڵ، ئەوا بەدڵنیاییەوە هێڵە گەورەکانی بەسن بۆ شاهێدیدان لەسەر وردیی ئەم ئاینزایە. چارەنووسی مرۆڤ لەدوای مردن، بژاردەکانی نێو ژیانی بڕیاری لەسەر دەدا، گیان"پڕەنسیپی رۆحی" کە توانای هەستکردن و گواستنەوەی هەیە، لە جەستە جودا دەکرێتەوە، لە رۆژی چوارەم کەژاوەیەک لە رۆحە باشەکان و شەیتانەکان یاوەری دەکەن و دەگاتە شوێنی حەشرکردن، کە لەوێ سێ خواوەند" میهر و راشو و سروش" هەڵدەستن بە کێشانەی کارەکانی بە تەرازوویەک لە زێڕ، پاشان فەرمانی پێدەکەن بە"پردی چاکە"دا بپەڕێتەوە. بۆ رۆحی خراپە کە لەم ژیانەدا خواوەندی شەڕی ئەنگرا ماینیو( Angra Mainyu)ی بە باشتر زانیوە، پردەکە لەبەردەمیدا دەچێتەوە یەک و دەکەوێتە نێو دۆزەخەوە.

گاتا وەرینەییەکانی[٣٧] زەردەشتی، چ وردەکارییەک لەبارەی چارەنووسی رۆحەکانەوە نادات: " تاریکی زەمەنێکی زۆر بەردەوام دەبێ، خۆراکێکی گەنیو، هاوار و فیغانی کڵۆڵانە، ئەمە ئەو ژیانەیە، کە کارە تایبەتە دژ بە باوەڕبوونەکەتان بۆی بریونەتەوە". لە تێکستێکی کۆنتردا هەندێ وردەکاری جۆراوجۆر هەیە" بۆ هەندێ کەس دۆزەخ سێ بەشی تایبەتمەندە: یەکێکیان بۆ بیری خراپ، دووەمیان بۆ گوفتاری

٣٧ : گاتاکان کۆمەڵە سروودێکی ئاینی زەردەشتی بوون و بەشێوەی وێرد گوتراونەتەوە کە هەر خودی وشەی(ورد یان أوراد) واتە ئەو وشانەی لەژێر لێوەوە بە دەنگێکی هێواش دەگوترێنەوە و لەزمانی عەرەبیدا هەیە، لەبنەچەدا وشەیەکی ئاڤێستاییە(وەرینە) پەڕیوەتە نێو زمانی عەرەبییەوە.

خراپ، سێیەم بۆ کاری خراپ، لە خوارەوە تاریکییەکی بێ کۆتاییە بۆ ئەوانەی تەواو خراپ بوون. ئەم تاریکستانە بۆ کەسانیتر، چینی جۆراوجۆرن بەپێی گرانی گوناهەکان رێکخراون: لە چینی سەرەوە، لە(هامستاگانی چەوسێنەرەکان) تایبەتە بەوانەی لە خراپەکاری تێوەنەگلاون، سزاکە تەنیا ساردی و گەرمییە، کە شەپۆلی هەوایی هەڵی- دەگرێ. لە چینی خوارەوە گوناهبارەکان دەخزێنرێنە نێو تاریکییەوە، لە شەختەدا دەبن و خوێنی پڕ کێم و جەراعەتیان دەرخوارد دەدەن، گۆشتێکیان دەخەنە بەردەم کە کرم تێیداوە، ئەو گوناهانەی لە ژیانیاندا ئەنجامیانداوە، دەبنە شەیتانەکان و ئەشکەنجەیان دەدەن.

ئازارەکان کۆتاییان نییە، سێ رۆژ وەک نۆ هەزار ساڵ وایە، بەڵام کاتێ کۆتایی دێت، کە دڵسۆزی"زیندوو" دێت، پاش ئەوەی لە پاکیزەیەک لەدایک دەبێ و بە ئاگر جیهان لە خراپەکاری پاک دەکاتەوە[٣٨]. ئەم بیرۆکەیەی دوایی لە سەردەمی پارسەکاندا لە سەدەی دووەمی پێش زایین بڵاوبۆتەوە، ئەویش بەهاتنی(میترا) کە لە نێو ئەشکەوتێ لە ژنێکی پاکیزە لەدایک دەبێ لە ٢٥ی کانوونی یەکەم، ئیدی ئەو هەواڵە نەمرییەکی یەکلاکارانە و سەرکەوتنێ بۆ ئاهورامەزدا هەڵدەگرێ.

---

٣٨ : مەبەستەکە ئەوەیە کە ئافرەتێکی دامێن پاک، منداڵێکی دەبێت کە لەدنیادا وەک هەڵبژاردە(المختار) دەستنیشانکراوە، بۆ ئەوەی پەیامی کۆتایی بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت و خەڵک بێنێتە سەر رێگەی راست، ئەم بیرۆکەیە لە تەواوی ئاینەکاندا هەیە، کاتێ جەجاڵ دێت و خەڵک شوێنی دەکەوێت کە لە ئایینی کریستیانیدا بە مەسیحی درۆزن ناودەبرێت و لەنێو پەیڕەوکارانی ئایینی ئیسلامیشدا بەهەمانشێوە ئەم چیرۆکە هەیە، بەڵام لەبری ئەوەی باس لە هاتنی مەسیح بکرێت، باس لە ئیمامی مەهدی دەکرێت، کە لەدنیادا وەک هەڵبژاردە دەستنیشانکراوە بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی لە ستەم و بێباوەڕیی، لەدوای بەرپابوونی ئەو دادوەرییە کە تەواوی سەرزەمین دەگرێتەوە، ئەوجا ژیان لەسەر زەمین کۆتایی دێت و قیامەت بەرپا دەبێت.

ئەم خەیاڵـــدانە نـــزیکە لەوەی کە لە هەمـــان دەور و ســـەردەم، لەناوجەرگەی ئاینی جولەکەدا سەری هەڵدا، هاوکات یەکیش دەگرێتەوە لەگەڵ رۆژهەڵاتییەکـی پێشـڤەچوو بـۆ هوشـیاریی مـۆراڵی، هەم لەگەڵ بەرۆحانیکردنی ئایینەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. بەڵام نەریتەکانیتر کە نەریتـی جیهـانی گریکـی-رۆمـانین، دوو نمـوونەی جیـاوازی لە دۆزەخ بە خەیاڵدا هێنـا، هەردوو نمـوونەکە لەگەڵ هەڵوێسـتە فکرییە تایبەتەکـان بە بلیمەتی رۆژاوایی یەکدەگرنەوە، کە ئەوانیش دۆزەخێکە زادەی نەریتـی شـــیعری هۆمیرۆســـییە، ئەوی دیکەشـــیان زادەی ئەنجـــامی تێڕامـــانی فەلســـەفی ئەبســـتراکت و ئەقڵانیـــیە. لە بەیەکگەیشـــتنی دۆزەخەکـــانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گریک و رۆمان، دۆزەخی کریستیانی لەدایکبوو.

# بەشی سێیەم
## دۆزەخی بتپەرستیی کلاسیکیی

لە وڵاتـــی گریـــک، دایکـــی شارســـتانییەتی رۆژاوا، رووخســـارە کلاسیکییەکانی دنیای دۆزەخیی دیاری کرا، ئەویش لەشێوەی شیعری خواستراودا(مەجازی)[39]. یەکەمجار لەگەڵ هسیۆد و هۆمیرۆس، دواتر لە ئەندێشە فەلسەفییەکانی پەیوەست بە خراپە و سزادانی نمایش کرا. دۆزەخـی گریکـی چ شـیعریی بـێ یـان فەلســەفی، لە دواجـاردا کەمتـر خواناســی بــووە. بەو پێـیەی وەڵامێکــی مــرۆییە بــۆ بــابەتی خــراپە، رووبەڕووی هەموو ئەگەرەکان دەبێتەوە، لە بنەڕەتدا سەرجەم چەمکە دۆزەخییەکانی دواتر لەخۆدەگرێ، لەنێویاندا تازەترینی ئەو چەمکانە، دۆزەخی بوونگەراییە(وجودیەت).

لە ئەنجامدا لەچەند گۆشەنیگایەکی مۆراڵی و دادوەریی و شیعری و فەلســەفییەوە تەماشــای ئەم شـیکارانە دەکـرێ. ئەم دۆزەخـانە زیـاد لەوانەی پێشــووی، پەیوەنـــدیی پـــتەوی بە بـــوارە کـــۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە هەیە. ئەمەش بەو مانایەیە کە زۆر مرۆییترە. گریکی-رۆمـانی بەجـۆرێکی تـایبەتی و لەســەر شـێوازی خۆیـان دۆزەخەکانیـان بونیادنـــاوە، ئەوان کەســـانی یاســـادانەر و کۆمەڵناســـن، بەشـــوێن کـــۆمەڵگەیەکی ئایدیالیـــدا وێـــڵ بـــوون، کەواتە ئەوان ناچـــار بـــوون چارەسەرێ بۆ ئاریشەی خراپە بدۆزنەوە.

١- دۆزەخی گریکی: شاعیران و فەیلەسوفان

---

٣٩ : مەبەست ناونانی شتێکە کە لە راستیدا بوونێکی راستەقینەی نییە، بۆ نموونە لێکچواندنی روومەتی شۆخێك بە مانگ لەلایەن شاعیرێکەوە، ئەوە بە گوزارەیەکی مەجازی دادەنرێت.

میتۆلۆژیـای گریـک لەسـەر ئەم بـابەتە، گەلـێ دەوڵەمەنـدە. کـۆنترین دانـراو لەمبـارەوە نووسـینەکانی هسـیۆد و هۆمیرۆسـە، کە دەشـێ لە دەوروبەری سـەدەی هەشـتی پـێش زایـین دایـان بنێـین. لەوێ قسەوباسەکان لەسەر دۆزەخ زۆرن، وەک شوێنێک کە تەنیا خواوەند و پاڵەوانەکان سەردانی دەکەن. تیزێ پادشـا کە سزای دۆزەخـی بەسـەردا سـەپێنرا، هیـراکلیس رزگـاری کـرد. دیۆنیسـۆس بـۆ دۆزەخ رۆیشـت تـا سیتلێ-ی دایکی دەرباز بکات، ئورفیە خەریـک بـوو سـەرکەوێ لە هێنـانە دەرەوەی ئۆریـدیس، ئەلسیسـت بەهـۆی ئەدمیـتەوە لە دۆزەخ هەڵدێ، هەریەکە لە تیریسیاس و ئاستیل و ئۆلیس گەشتیان بۆ دۆزەخ کردووە.

ئایـا ئەم دۆزەخـانە ئاسـایین، وا بەو ئاسـانییە سەرسـوڕهێنە، خەڵـک بتوانن هاتوچۆی بکەن، یـان تەنیا پاڵەوانەکـان و خواوەنـدەکان دەتـوانن؟ تیۆگۆنیـا و ئەلیـازە و ئۆدیسـە بە روونـی باسـی ئەوە نـاکەن. یەکەمجـار تیاچووەکـان وەک قوربانیـانی زیۆسـی خواوەنـد دێـنە پێشـچاو، کە هەر کەسـێ دژی ئارەزووەکـانی بوەسـتێتەوە، رەوانەی دۆزەخـی دەکـا. لە ئۆدیسـەدا هـاتووە کە، ئـۆلیس کـاتێ سـەردانی دۆزەخـی کـرد، دیمەنـی ئەشکەنجەدانی هەندێ لە پاڵەوانە ناودارەکانی بینیوە:

" تیۆسـی کـوڕی زەمینـی سـەرفرازیم بینـی، لەسـەر خـاک راکشـابوو، رووبەری نۆ دۆنم خۆڵ جەستەی داپۆشیبوو، لەسەر رانەکانی دوو داڵ جەرگیان هەڵدەدڕی و دەنووکیـان دەچەقانـدە هەنـاوی، بێئەوەی بتـوانێ بەدەستەکانی دووریان بخـاتەوە، چونکە کاتێ لە رێی پـانوپێ-وە بەرەو پایتۆی شاری حەشاماتە جوانەکان چوو بوو، (لیتۆ)ی هاوسەری زیۆس و خـاوەنی نەمریـی و سـەرفرازیی هەتـک کردبـوو. تانتالیشـم لە دەریـاچەکەدا بینـی، ئـازارێکی بێـوادەی دەچەشـت، ئـاو گەیشـتبووە لا چەناگەی، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر تینوو بوو، نەیدەتوانی بگاتە ئـاوەکە، هەر

کـاتێ ئەم پیرەمێـردە نەوی دەبـۆوە بـۆ ئەوەی گـڕی تینـوێتی خـۆی بشـکێنێ، ئـاوەکە لەبەری هەڵـدەهات و زەوی لووشـی دەدا، بەر پێـی دەبووە خاکێکی رەش، یەکێ لە خواوەندەکان وشکی دەکردەوە. درەختە بڵنـدە بەگەڵاکـان، بەروبوومەکانیـان بەسـەر سـەریدا شـۆڕ دەکـردەوە، هەرچەنـدێ پیرەمێـردەکە دەسـتی بـۆ دەبـردن لێیـان بکـاتەوە، رەشـەبا بەرەو هەورە چڵکنەکانی فڕێدەدان.

لەوێ سیزیف-م بینی بەدەم ئازارێکی توندەوە، بە هەردوو بـازووی بەردێکـی زەبەلاحـی بـۆ سـەرگردەکە سەردەخسـت، بەڵام کە دەگەیشـتە سەر قوتەکە، تاشـە بەردەکە بە پشـتا دەکەوت و دووبـارە بەردی هـیچ و پووچ بەرەو پێدەشتەکە خلۆر دەبۆوە. سیزیف جارێتر بەهەموو هێزیەوە پاڵی دەنا و ئارەقە لە گیانی دەچۆڕا، تەپوتۆز چەنـدین شـەبەنگی لەسـەر سەری دروست دەکرد".(سرودی XI).

پێ دەچـێ دۆزەخ چارەنووسـی هاوبەشـی هەمـوو خەڵـک بێ. بەپێـی نووسـینەکانی ڤیکتـۆر بیـرار، رەنـگە بـڕگەکەی پێشـوو، دواتـر دەسـتکاری کرابـێ، لە کاتێکـدا تێکسـتی یەکەمـی هـۆمیرۆس، زۆر خـۆی لە قەرەی بـوونی ئەشـکەنجەدان نەداوە، بەڵام هەرچـۆنێ بـێ ئەم چەمکـی دنیـای مـردووانە، زیـاد لەرادە رەشـبین بـووە و ترسـێ روون و دیـار لای کـۆمەڵگەی گریکـی کـۆن ئاشـکرا دەکـا، کە ژیـانی زەمینـی بەر تیشـکی خۆریان سـەرفراز کردووە. لە ئەلیـازەدا دەبێژێ:" تـاریکییە تەماوییەکـان پشکی هادیس[٤٠] بوو، پشـکی ئاسـمانی فـراوانیش بۆ زیـۆس". دەروازەی

---

٤٠ : یان هیدز برای زیۆس بووە، پادشای جیهانی ژێرەوە، دنیای مردن، لەبەرئەوەش ناونراوە هادیس، چونکە ماناکەی واتە شاراوە، بەهۆی ئەوەی کڵاوێکی لەسەردا بووە دەیشاردەوە، هاوکات هێمایەکیشە بۆ ژێر زەوی  کە جێیەکە سامان دەبەخشێت، بەو پێیەی کە جیهانی ژێرەوەی زەوی پڕ لەکانزای بە بەهایە.

چوون بۆ ئەم جیهانە خەمۆکییەی ژێرزەمین، دەکەوێتە لای کۆتایی گۆی زەویـیـەوە، وەختـی ڕۆژاوابـوون تـۆقێنەرە. ئـۆلیس دەڵـێ:" پـیس وەک دەرگاکانی هـادیس". لە کاتێکدا ئەخیل[٤١] ڕایدەگەیەنێ" وەک دەرگاکانی هـادیس ڕکـم لێیـان دەبێـتەوە". لەجێیەکـیتـردا دەڵـێ:" پێمخۆشـە بـبمە نـۆکەری گـاوانێ، نەک فەرمـانڕەوای کـۆمەڵێ سـێبەر بـم". بەڵام چارەنووسـی ئەوانەی لە دنیـا گۆڕێکیشـیان بە نسـیب نەبـوو وەک پـاترۆکلیس، لەگەڵ ئەوانەی لە دۆزەخـدا پێشـوازییان لـێنەکـرا، زۆر خراپتـرە:" سـەرگەردان و بـێ جـێ و ڕێ لەدەوری دەروازەکە دێـن و دەچن".

دۆزەخ دنیایەکی داخراوە، هسیۆد بە گۆزەیەکی زەبەللاحی دەچوێنێ، یان بە ئەشکەوتێ، ڕووبار دەورەی داوە و لقەکانی ستیکس و کۆسیت و ئەکیرۆن لە کەشێکی تەڕ و تووش و بۆگەن، لە دنیای زیندووەکانی جـودا دەکـاتەوە. چاکەکـار و خراپەکـار یەک چـارەنووس دەناسـن، دوو بەرەڤـان هەڵدەسـتن بە جیاکردنەوەیـان، ئەوانـیش ڕادامۆنـت پـاڵەوانی قەریتشـی و مینـۆس-ی بـرای، هەردووکیـان بە دادوەریـی و پیتـۆڵی ناسراون. چاکەکاران بە باخێ لە گوڵەزەنبەق دەشۆردرێن یان لە"دەشتی فیـردەوس"، بەڵام نـازانرێ بە چ بـڕگەیەک حـوکمدراون، هەرچـۆنێ بـێ نیشـتەجێبوون لە(تەرتـار)[٤٢] مـاڵی تیتـان کە دەکەوێتە ژێری هادیسـەوە، ئەوە بۆ خۆی کۆتاییە. دوایەمین سیماکانی خۆپاراستن لەجیهـانەکەیتر،

---

٤١ : ئەخیل یان ئەشیل، لە ئەفسانەکانی گریکدا یەکێکە لە پاڵەوانە ئەفسانەییەکان و ئەو کوڕی بیلیۆس-ی پادشای فتیا بووە، ئەخیل ڕۆڵێکی کاریگەریی لە جەنگی تەروادەدا هەبووە.

٤٢ : وەک دەستەواژەیەک بەکارهاتووە بەرانبەر بە شوێنێکی ترسناک و تۆقێنەر کە گیانەکان پاش مەرگ بۆ ئەوێ ڕەوانە دەکرێن، ئەم وشەیە زیاتر تورکییە و بەمانای قووڵایی دێت.

ئەوەیە کە گیانی مردووەکان هەڕەشەن لەسەر زیندووەکان، ئۆلیس لەمە ئاگادار کرابوو، بۆیە ناچار بوو هەڵبێ:

" گیانە مردووەکان لە قولایی ئیریب جەم دەبن: ژنە گەنجەکانن، لاوەکانن، پیرەمێردگەلێکن کە ژیان ژیری کردوون، پاکیزەگەلێ تەڕن، کە دڵی کاڵیان ئازاریتری نەنۆشیوە، چەندێ لە جەنگاوەرە تەنگەئەستوورەکانە، سیکاردی[٤٣] بە برۆنز زاخاودراو بریندراری کردوون و هەر بە چەکی خۆیان، کە خوێنی لێدەچۆڕا، بوونەتە قوربانی ئارس[٤٤]! دەستەبەدەستە لەهەموو لایەکەوە بەرەو هەڵدێر دێن، ژاوەژاوێکی سەیریان دروستدەکرد، بەلام من ترسێکی زۆر گرتمی". (ئۆدیسە، سرودی XI).

لێرەدا تێکەڵەیەک لە بوونەوەران دەبینین، بە چارەنووسێکی زەمینیانەی زۆر جیاواز ئاشنا بوون، کۆبوونەتەوە و جیاوازییش لەنێوانیاندا نییە، دیمەنەکانیان ناڕەزایەتی دەردەخا، ئەوە چەمکێکە نزیکە لە چەمکی دۆزەخی میزۆپۆتامیا. ئەم دۆزەخە شیعری و تەماوییەی یەکەم، لە گریکی کۆندا دەبێتە سەرچاوەی هزرێ زۆر لە سەدەی شەش بۆ چوار(پێش زایین). دیمەنە شاکارەکە لانکەی سروش بووە بۆ شاعیران و شانۆنووس و زانایانی مۆراڵ، برەوی زیاتریان بە بیرۆکەی قیامەتی پاش مەرگ داوە. زیۆسی خواوەند لەسەر زمانی ئەسخیلۆسەوە" سزای مردووەکان لەسەر هەڵەکانیان دەدا، لەمەشدا هەریەکە لە پندار و سۆفۆکلیس و ئەریستۆڤان هاوڕان"[٤٥].

---

٤٣ : وشەیەکی کوردی پەتییە، بەمانای چەقۆی گەورە دێت و زیاتر لەنێو شێوەزاری هەورامیدا دووپات دەکرێتەوە.

٤٤: لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا بە خواوەندی جەنگ دەگوترێت و کوڕی زیۆسە.

٤٥ : ئەریستۆڤانیس(٤٤٦ی پ.زایین– ٣٨٦ی پ. زایین) یەکێکە لە پێشڕەوانی شانۆی گاڵتەجاڕیی لە یۆنانی کۆندا و خاوەنی چەندین دەقی شانۆیی کۆمیدییە. سۆفۆکلیس(٤٩٦ی

فەیلەسوفەکان زیاتر رەخنەگر بوون، بۆ یەکەمجار پیاوانی هزر کەوتنە تێفکرین لە بابەتی شەڕەنگێزیی مۆراڵی، هەر لە رەگوڕیشەی دروستبوونیەوە و سزا چاوەڕوانکراوەکەی لە دنیاکەیتر. ئەنجامەکانیان زۆر خۆپارێزانە بوو. زۆرینەیان گومانی گەورەی خۆیان لەهەمبەر دۆزەخ دەربڕیبوو. خراپە بەلای هیراکلیت[٤٦]، فاکتەرێکە لە فاکتەرەکانی هەماهەنگیی گەردوونی. بەلای لۆسیپ و دیمۆکریتسەوە[٤٧] پەیوەستە بە رێکەوتەوە و مەسەلەی سزاش شایانی بەهەند وەرگرتن نەبوو، لای فیساگۆرس هەمان بۆچوون هەبوو. بەڵام سۆکرات خراپەی بە ئاکامی نەزانین دادەنا، کە نەزانین هەر بۆ خۆی سزایە. ئەرستۆ زیاتر قاڵ بۆوە: مردنی تاکەکەس بەو پێیەی گیان و جەستە دەگرێتەوە، کەواتە لە دنیاکەیتر دۆزەخ بوونی نییە. مرۆڤ لەم ژیانەدا کە پەیوەست دەبێ بە بەها پووچەکانەوە، هەر ئەوە بۆ خۆی تووشی نەهامەتیی دەکا. ئەبیکۆر وا دەبینێ کە خواوەند گوێ بە کارەکانی مرۆڤ نادات، کەواتە

---

پ.زایین- ٤٠٥ی پ.زایین) یەکێکە لە سێ نووسەرە مەزنەکەی گریک لە بواری شانۆی تراژیدیا، بەڵام تەنیا حەوت بەرهەمی بەزیندوویی ماونەتەوە کە یەکێکیان(ئۆدیب پادشا)یە و گەلێ بەناوبانگە. بندار یان پیندارۆس(٥٢٢ی پ.زایین- ٤٤٣ی پ. زایین) یەکێکە لە گەورەترین شاعیرەکانی یۆنان و شیعرەکانی زیاتر بە شیعری گۆرانی ناسراون.

٤٦ : فەیلەسووفێکی یۆنانییە و پێش سوکرات ژیاوە، لەخانەوادەی پادشایان بووە لە شاری ئەفسس، سەر بەهیچ قوتابخانەیەکی فیکری نییە، بەڵکو بەخۆی خاوەنی فەلسەفەیەکە کە کاریگەریی لەسەر ئەرستۆ و ئەفلاتۆن و نیچە و هایدگەر هەبووە. هیراکلیتۆس بە فەیلەسووفی گریان ناسراوە، لەبەرئەوە بۆ گەمژەیی مرۆڤ گریاوە، بە پێچەوانەی دیمۆکریتس کە پێکەنینی بە مرۆڤ دەهات لەبەرئەوەش بە فەیلەسووفی پێکەنین ناسراوە.

٤٧ : هەردووکیان فەیلەسووفن و هاوچەرخی هیراکلیتۆسن.

حەشـرکردن و قیـامەت بـوونی نیـیە. ڕەواقیەکـان[٤٨] هەروەک سـینیک[٤٩] پێیـانوایە، دۆخـی مردووەکـان، هەر بـۆ خـۆی وەک ئەوانەیە کە هێشـتا لەدایک نەبوون، واتە نەبوون(العدم). دۆزەخ لای شیشرۆن[٥٠] قسەی هیچ و پـووچی شـاعیرانەیە، تەنیـا بـژاردە ئەوەیە یـان هەرمـانییەکی(ئەزەلی) بەختیار، یان نەبوون.

هزرڤانەکـانی گریـک و ڕۆمـان، بـێ چەنـد و چـوون چەمکـی دۆزەخ ڕەتدەکەنەوە و، وای دادەنێن بیرۆکەی خواوەندێک کە دادگایی خەڵک بکا لەسەر کارەکانی، بیرۆکەیەکی نالۆژیکییە. خواوەند بۆ زۆرێ لەوانە گەر بـوونی هەبـێ، بـایەخ بە خەڵـک نـادات. دنیـای خواوەنـد تەواو لە دنیـای مرۆڤ نامۆیە. گەر دۆزەخ بوونی هەبێ، ئەوا پیاوەکان بەخۆیـان لەسـەر زەوی بونیاتیـان نـاوە، هەر خۆشـیان بە بەردەوامـی سـەرکۆنەی خۆیـان دەکەن، لەدەسـت دڵکوێرییـان و شـوێنکەوتنی خەیـاڵە بـێ بـێ بەهـا و پووچەکانیان. لە سـەدەی پێنجی پێش زایینەوە شـان بە شـانی یەکتری، سـێ چەمـک لەبـارەی دۆزەخەوە لە دنیـای گریـک و ڕۆمانـدا هەبـوون: دۆزەخـی بـوونگەرایی، کە لەسـەر زەوی دەیبینـین و ئەمەش دۆزەخـی لۆکریسـە، دۆزەخی فەیلەسوفەکان و ێناکردنێکی لۆژیکییانەی پێویستە،

---

٤٨ : یەکێکە لە فەلسەفە نوێکانی شارستانییەتی هلنستی، ئەم فەلسەفەیە بڕوای وایە کە فەلسەفە تەنیا زانستێکی کاتبردنەسەر نییە، یان بە تەنیا زانستێکی ڕووت نییە، بەڵکو شێوازێکە لە ژیان و فەلسەفەش وەک مەشقکردن تەماشا دەکەن، زینۆن(٣٣٤ی پێش زایین– ٢٦٢ی پێش زایین) بە دامەزرێنەری فەلسەفەی ڕەواقی دادەنرێ.

٤٩ : فەیلەسووفێکی ڕێبازی ڕەواقییە و خەڵکی ڕۆمانیایە، کەسێکی سیاسی و نووسەری شانۆگەری بووە.

٥٠ : نووسەری ڕۆمانی و وتاربێژی ناوداری ڕۆما، لە بنەچەدا ناوی مارکۆس تولیۆس کیکرۆیە، لە ساڵی ١٠٦ی پێش زایین لەدایکبووە، خاوەنی زۆرترین بەرهەم بووە و بۆچوونی تایبەت بەخۆی هەبووە، بە باوکی فەلسەفەی سیاسی دادەنرێ و زیاتر بۆچوونەکانی لە ڕاکانی ئەرستۆوە نزیک بوو.

بۆ باشکردنی بەڕێوەچوونی کارەکان لە شار-دەوڵەت، هەم لە ئاکامی ئەوەش کە خواوەند لەهەمان کاتدا چاکەی ڕەها، بوونی هەیە، ئەمە دۆزەخی ئەفلاتوونە. دۆزەخی میللی وێنەیەکە لە ئارەزووی دادوەریی و تۆڵەسەندنەوە، شەڕەنگێز و خراپەکاران تێیدا دەبنە قوربانیی ئازارە زەقەکان: ئەمەش دۆزەخی ڤرجیلە.

٢-دۆزەخی بوونگەرایی لۆکریس

لۆکریس، شاعیر و فەیلەسوفە، لە دەوروبەری ساڵی ١٠٠ی پێش زایین لەدایکبووە و لە ٥٥ی پێش زاییندا مردووە. لەپاش خۆی قەسیدەیەکی فێرکاریی گەلێ ناوداری جێهێشتووە لە شەش بەشدا بەناوی(لەسروشتدا) کە ڕوونکردنەوەیەکە بۆ هزرەکانی ئەبیکۆر، لەنێویدا چەمکێکی زۆر نوێ لەبارەی دۆزەخەوە دەبینین، چەمکێکی تایبەت بە دەستەبژێری فیکری، کە هەتا ئێستاش نوێنەری ئەو دەستەبژێرە لە سەدەی بیستدا دەبینرێ.

ئەندێشەکانی لۆکریس هەڵگری ڕەهەندێکی قووڵی مرۆیی و ڕەشبینییەکە کە گوزارشتە لە مرۆڤێ، دەرک بە تەنیاییەکی مەزن دەکا، کە بوونەوەری هزرڤان تێیدا دەژی، ئەویش ئەوەیە: چاوەڕێی هیچ شتێ لە دنیای دووەم مەکەن، ئەوە بەرهەمی خەیاڵدانی شاعیرەکانە، مەرگ تەنیا دەروازەیەکە بۆ دەرچوون لەم تەنیاییە، یەکلاکار و سەراپاگیر، ترس نییە لە هیچ دۆزەخێکی سەروو سروشتەوە: دەبێ ئەو ترسە تێک بشکێ و لە ئەکیرۆن وەدەربنرێ، کە بە هاتنی بۆ نێو قووڵایی مرۆڤ، پشێوییەک لە ژیانیدا بەرپا دەکا و سەراپای ڕەشپۆش دەبێ. ئەو ئەفسانانەی باس لە دۆزەخ دەکەن، دەستکردی ئایینەکانن و ئامانجیان برەودانە بە ترس، بەڵام بێهوودەیە. هەرچەندە لەوێ دۆزەخی ڕاستەقینە هەیە، زۆر ڕاستەقینەیە، ئەویش دڵەڕاوکێیەکە پەیوەست بە خودی

خۆوە، کە ژیوایی[٥١] هەبێ(واتە کەسێ لە ژیاندا تەمەن بەڕێ بکات و بە گوزەرانیەوە سەرقاڵ بێت) مانای وایە دەترسێ، لەمردن دەترسێ، لە ئازار، لە نەخۆشی، لە سزا، لە خواوەند، لە ئازاری ویژدان، سەرچاوەی ئەم ترسە، شەڕەنگێزیی راستەقینە بێ یان خەیاڵدان، شتێکە لە ژیان جودا نابێتەوە. ئەم بارگرژییە هەمیشەییە لە نێوان جەختکردنەوە لە خود و مەترسییەکانی، بریتییە لە کەڵکەڵەی بوون، ئا ئەوە دۆزەخە:" هەموو مرۆڤێ هەوڵدەدا لە خودی خۆی هەڵبێ، بەڵام بێئەوەی بتوانێ دەرباز بێ، بەخۆیەوە دەبەسترێتەوە، گەرچی لە خودی خۆی بێزارە" کەواتە چارەسەر مردنە: لۆکریس لە تەمەنی چلوپێنج ساڵیدا خۆی کوشت.

لە لاپەڕەیەکی پرشنگداری کتێبی(لەسروشتدا)ی لۆکریس، ئەفسانەکانی دۆزەخ بۆ ژیانی سەرزەمینی دەگوازێتەوە، بەهایەکی سیمبوڵیانەی ئازاربەخشیان دەداتێ:" بەدڵنیاییەوە، هەموو ئازار و ئەشکەنجەکان کە بڕوا باوەکان لە ئەکیرۆندا ئامادەی دەکەن، سەراپایان هەرچی جۆرێ بن، لە ژیانی خۆماندا دەیاندۆزینەوە". هەروەک ئەفسانەکە دەڵێ چ ترسێک لە تانتاڵی کڵۆڵ نییە و ترسەکەش چ بنەمایەکی نییە، کە بەردەوام لەو بەردە زەبەلاحە دەترسێ کە هەڵواسراوە بە راسەرییەوە، بەڵام بەمانایەکیتر ئەوە ترسێکی بێپەروابیانەیە لە خواوەند کە ژیانی بە تەمەنەکان دەشێوێنێ، ترسێکە لەو بەڵایانەی کە هەڕەشە لە چارەنووسی هەریەکەیان دەکا. تەنانەت تیتیۆس-یش بە راکشاوی لە ئەکیرۆندا بوونی نییە، کە گوایە چۆلەکەکان پارچە پارچەی دەکەن، هەرچەندێ بۆی بگەڕێیت و هەرچەندێکیش کات

---

٥١: وشەیەکە لە شێوەزاری هەورامیدا بەکاردەهێنرێت، بەرانبەر بە ژیانداری.

بەسەریدا درێژە بکێشێ، ئەو دیمەنە لەسەر سنگی پانی نابینرێ. چەندێ جەستەی زەبەللاحی راکشاوی، ترس بخاتە دڵەوە، ئەندامە لەتوپەتکراوەکانی جەستەی نەک نۆ دۆنم زەوی، بەڵکە هەموو زەویش داپۆشێ، ناتوانێ تا کۆتایی بەرگەی ئازارێکی هەتاهەتایی بگرێ، ناشتوانێ جەستەی وەک مێرگێ پێشکەش بکات، کە نەزانێ وشکبوون چییە.

"بەڵام تیتیۆس بەلای ئێمەوە هێشتا لەسەر زەوی دەژی: ئەو لە ئەڤینداریدا کەسێکی قۆڵبڕە، هەڵۆکانی ئیرەیی پارچە پارچەی دەکەن و دڵەڕاوکێیەکی تەواو ونجڕ ونجڕی دەکا، ئەوەی دڵی دەگوشێ، ئازارە بەسوێکانی یەکێ لە ئەڤینیەکانیەتی. سیزیف خۆی لەم ژیانەدا بوو، بە چاوی خۆمان دیتمان، بۆ تەشێ و تەورە تۆقێنەرەکان لە میللەت دەپاڕایەوە، دەگەڕایەوە و هەمیشە بە تێکشکاوی دەگەڕایەوە، دڵ پڕ لە ناسۆر و گرێ. چونکە هەوڵدان بۆ دەسەلات، کە دەستکەوتنی تەنیا خەیاڵ و مەحاڵە، بۆ هەتا هەتایە هیلاکی بەخشە، بەڕاستی پاڵنانێکی لێبڕاوانەیە بە بەردێک لەسەر لێژایی چیایەک، ئەو بەردەی کە کەمێکی ماوە بگاتە لوتکە، بەڵام سەرلەنوێ بەرەو خوارەوە خلۆر دەبێتەوە، بۆ دەشت. هەر لەسەر ئەم نموونەیە برەودانی بێهودە بە ئارەزووە چاوچنۆکەکانمان و بارگرانکردنیان بێئەوەی تێر ببین، هەروەها شێوازی وەرزەکان، کە لە گەڕانەوەی ساڵانەیاندا، بەروبوومە جیاوازەکانمان بۆ بەرهەم دێنن، بێئەوەی حەزمان زاخاو بدەن، وا بزانم ئەمە ئەوەیە کە کیژانێک لە تەمەنی گوڵدا هێمای بۆ دەکەن، و سەرقاڵن بە ئاوگرتن لە دەفرێکی بێ بندا، کە هەرچەندێ هەوڵدەدەن ئاو عەمبار بکەن، بەڵام پڕ نابێ. دووبارە و دووبارە سیربیر و خواوەندە بێزارەکان

و نەمانی رۆشنایی لە تەرتار، کە دەمی گڕی لێوە دەردەچێ، لە هیچ شوێنێ نییە و ناشکرێ کە هەبێ.

بەڵام لەبەرامبەر خراپەکارییە زۆرەکانی ژیان، ترسێکی گەورە لە سزا هەیە، لە بەرامبەر گوناهە و تەکفیر: زیندان، کەوتنێکی تۆقێنەرانە لەسەر بەردێ، شمشێرلێدان، قامچیدار(جەلاد)، پڵپڵە، زفت، نێزەی(رم) سوور، مەشخەڵ، تەنانەت لە نائامادەیی ئەم سزایانە، گیانی پڕ لە تاوان و تۆقیو لە تەکفیرکردنیان، هەوڵدەدا خۆی دەرزی ئاژن بکا، قامچی بارانی خۆی بکا بێ ئەوەی بزانێ کۆتایی ئەم ئازارانە دەشێ بە چی بگات و لەدواجاردا چارەڕەشی چۆن دەبێ؟ بە پێچەوانەوە دەترسێ لەدوای مردن، ئازار و نەگبەتییەکانی زیاتر بن.

لێرەدا، لەدواجاردا لەم جیهانە، ژیانی گەمژەکان دەبێتە دۆزەخێکی راستەقینە( لەسروشتدا-بەشی سێیەم لاپەڕە٩٧٨-١٠٢٤).

٣-دۆزەخی فەلسەفیی ئەفلاتۆنی:

ئەفلاتۆن بەواتا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی رووبەڕووی چەمکێکی سایکۆلۆژیی پەتیی وەک دۆزەخ دەبێتەوە. لە ئەنجامدا بایەخدانەکەی، زیاتر بەهەند وەرگرتنێکی یاساداڕێژەرانەیە، وەک لەوەی جێی بایەخی زانایەکی بواری مۆراڵ یان تیۆلۆژی بێ. تێڕوانینەکانی دادوەریی و یاساییین. زیاد لەوەش پێکەوەبەستراو نین، جیاوازییەکی ناوەکی لەنێوان نمایشی فیدۆن و نمایشی کۆمار و خستنەڕووی گۆرجیاسدا هەیە کە، سێ گفتوگۆن و بە روونی باس لە دۆزەخ دەکەن.

تەنیا شتێ دڵنیابەخش بێ، ئەوەیە کە پاش مردن، رۆژی حەشر چاکەکاران و خراپەکاران لەیەکدی جودا دەکاتەوە. لەم پێودانگەوە چارەنووسی شەڕەنگێزان دەگۆڕێ. لە گفتوگۆی فیدۆن باس لە دوو

دەستە دەکرێ، کە ئەوانیش: ئەوانەی بە تیاچوونی هەتاهەتایی سەرکۆنە کراون، لەگەڵ ئەوانیتر.

" ئەوانەی بارودۆخیان چ ئومێدی لەسەر بونیاد نانرێ، بەهۆی گەورەیی گوناهەکانیانەوە، بەرپرسن لە زۆرێ لە رووداوە مەترسیدارەکانی دزیی، کە دژ بە مالآن ئەنجامیانداوە، مرۆڤکوژەکان، ستەمکارانە و رێ پێنەدراوانە کردوویانە، بکەری هەموو گوناهەکانیتری لەمجۆرە، ئەو چارەنووسەی شیاویانە، فڕێیاندەداتە نێو تەرتار، کە هەرگیز لێی نایەنە دەرەوە. بەڵام ئەوانەی گوناهەکانیان وا دادەنرێ، بێ چارەسەر نین، بەزۆرەملێ دەخزێنرێنە تەرتارەوە". دواتر پاش ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ لەوێ دەمێننەوە، شەپۆلێک فڕێیان دەدا، پاش ئەوەی دەگەڕێنرێنەوە بۆ ئەوێ، بەدەنگێکی بڵند بانگ دەکرێن، هەندێ لەوانە، ئەو کەسانە بانگێشت دەکەن، کە بوونەتە هۆکاری تیاچوونیان، هەندێکیتر ئەوانە گاز دەکەن کە بەخراپی مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون. دوای بانگکردنەکە، دەپاڕێنەوە کە وازیان لێبێنن لە رووبارەکە بێنە دەرەوە و بپەڕنەوە بۆ دەریاچەکە، تا لەوێ پێشوازییان لێبکەن، گەر توانییان رازییان بکەن، ئەوا دەپەڕنەوە و بەوەش سنووری بۆ ئازارەکانیان دادەنێن، خۆ گەر نەیانتوانی ئەوا سەرلەنوێ دەبرێنەوە بەرەو تەرتار و لەوێشەوە بۆ رووبارەکە: ئەمە مامەڵەیەکە کۆتایی نایەت، تا قوربانییەکانیان رازیی دەبن، بەوەی ستەمیان بەرامبەر کردوون، چونکە ئەوە ئەو سزایەیە کە دادوەران بەسەریاندا سەپاندوون(١١٣-١١٤).

ئەم گفتوگۆیە رووبەڕووی ئەگەری سێیەم دەبێتەوە، حوکم بەسەر ئەو گیانانەدا دەسەپێنێ، کە بەدرێژایی ژیانیان یەخسیری ئارەزووەکانی جەستە بوون، ئەویش بە ئاوارەبوونیان لە زەوی، کە توخمی ماددی

بەرەو خوارەوەیان کێش دەکا: کاری بەوە تەواو دەبێ کە بچێتە پێستی ئاژەڵێکەوە، بەرجەستەی ڕێبازە شەڕەنگێزییە بەسەردا زاڵبووەکەی بکا.

لەگفتوگۆی گۆرجیاس-دا تێبینیی جیاکارییەک دەکرێ لەنێوان ئەوانەی لێبووردن نایانگرێتەوە لەگەڵ ئەوانی تر. هەمووان دەخرێنە ژێر ئەشکەنجەیەکەوە کە ئامانجەکەی یەکێک نییە، بەڵکو ئەوە بۆ هەندێ پوختەیەکی خۆبەخشانە و پاکژکارانەیە، بەواتایەکیتر کاتییە، بۆ هەندێتر کە بەهای پەند و نموونەیە، لێبوردنیان بۆ مسۆگەر ناکات: ناتوانێ فریادرەسیان بێ، چونکە گوناهی زۆر گەورەیان کردووە، بەڵام ئەشکەنجەدانیان بە هۆشدارییەک بۆ تەواوی خەڵک دادەنرێ، کە گەر خراپە بکەن، چ شتێ چاوەڕێیان دەکا، ئەوانەش ئەمانەن:

" ئەوانەی بەرژەوەندییان وادەخوازێ سزایان بەسەردا بسەپێنرێ، کە خواوەند یان مرۆڤ بەسەریدا سەپاندوون، ئەوانەش کە گوناهەکانیان لێ-خۆشبوونی نییە. چ باشەیەکیان نایەتەڕێ کەمتر بێ لەو شێوازی ئازارەی لەم دنیایە و لە هادیسدا هەیە. چونکە بەم ڕێگەیە نەبێ، چ ڕێیەکی دیکە نییە لە دلڕەقیی خۆیان دەربازیان بکات."

" بەڵام ئەوانەی زۆردارییان گەیشتۆتە ئەوپەڕی و کارە ستەمکارەکانیشیان لە رادە بەدەرە، تیادەچن، ئەوانە دەبنە نموونە و پەندیان لێوەردەگیرێ، هەر ئەو خەڵکانە لەبەرئەوەی لەناوچوون، لە سزاکانیشیان هیچیان دەستناکەوێ، ئەوانە سوودمەند دەبن، کە تیاچووەکان دەبینن چۆن بەهۆی هەڵەکانیانەوە سزا دەدرێن، لە ئەزموونە هەتا هەتاییەکانیان، لە ترسناکترینیان و بەسوێترین و تۆقێنەرترینیان فێر دەبن: ئەوانە لەوێ لەهادیس بەڕاستی هەڵواسراون، لەزیندانێکن شایانی تێڕامان و بەهەندوەرگرتنە بۆ ستەمکارانێ کە تازە بەتازە دێن(گۆرجیاس ٤٨٦)".

ئامـانجه سیاسـییەکه لێـرەدا روونه، له راسـتیدا ئەم تیـاچووانه ئەوانەن که زێدەڕۆییان له ئازاردان و خراپەکاریدا کردووه، ئەوانیش پیـاوانی سیاسـەت و پادشا و دەسەڵات زەوتکەرەکانن. له گفتوگۆی فیدۆن-دا تیاچووەکـان ئەوانەن که بەرپرسـیارن له کێماسـی کـۆمەڵایەتی. گەورەتـرین گونـاهه وتـاوان بەپێـی کۆمـارەکەی ئەفلاتـۆن، گوناهەکـانی(ئەوانەن که بـوونه هـۆی مردنـی زۆرتـرین خەڵـک، یـان ئەوانەی ناپاکییـان لەهەمـبەر نیشـتمان و سـوپاکەی نوانـدووه، هاوولاتیـانی خۆیانیـان کـۆیله کـردووه...). سـزای هەر کـارێکی سـتەمکارانه بـۆ ئەوانه، سـەد سـاڵ ئەشـکەنجەدانه. لەم گفتوگـۆیەدا ئەفلاتـۆن پەنـا دەبـاتەبەر ئەفسـانەی ئێـر(Er) که دابەزیـوەته دۆزەخ و له مـردن هەسـتاوەتەوه، ئەوەی گێڕاوەتەوه که بینیویەتی، بەسـوودوەرگرتن له ئەفسـانه میللییەکـان تـا وەسـفی شێوازی شەیتانەکان بکات له ئەشکەنجەدانی تیاچووەکان.

" هەردوو دەسـت و قـاچ و سـەریان دەبەسـتنەوه، لەسـەر زەوی درێژیـان دەکەن، جلەکانیان لەبەردا دادەکەنن، بەدرێژایی رێگەکه رایاندەکێشـن و لەسـەر لا بەسـەر درکـی پەرژینەکەدا دەیـانبەن، ئەشـکەنجەدراو بەردەوام لەهۆکـاری ئەم مامەڵەیان لەو رێبوارانه دەپرسـێ که بەوێدا تـێدەپەڕین، ئەوانیش پێیـان- دەگوتن که دەبرێن بەرەو تەرتار تا لەوێ نغرۆیان بکەن"(کۆمار X،٦١٦).

لەنێو(کۆمـار) ئەشـکەنجه هەتـا هەتاییەکـان بـوونی نییه، له کۆتـایی هەمـوو هەزار ساڵێکدا گیانەکان دەگەڕێنەوه و رۆڵ دەبیننەوه.

سەخته بڕیار بدەین تا چ ئاسـتێ ئەفلاتۆن بڕوای به دۆزەخ هەبووه، تـا چ رادەیەکیش ئەفراندنی دۆزەخ بۆی هوشیارانه بووه، تـا به یاسـاکانی سـەروو سروشـت، پشـتیوانی له خەیـاڵه داڕێژراوەکـانی بکـات. له گفتوگـۆی گۆرجیـاس بەرێگەیەکی تەواو ناڕۆشن، نێوانی ئەفسـانه و مێژوو جیادەکاتەوه، سـۆکرات به رووی کەلیکیسـدا دەبێـژێ: کەواته وەک دەڵـێن گـوێبگـره بـۆ مێـژووی پرشنگدار، من بڕوام وایه تۆ ئەمه به هەڵبەستراو دادەنێیت، بەڵام بەبۆچـوونی

من ئەمە مێژووە، وا بەخەیاڵیشمدا دێ، ئەوەی پێت دەڵێم راستییەکانە". پاش کەمێ سۆکرات هەستدەکات، گومان بۆ لای گوێگرەکەی هەڵکشاوە، پێی-دەڵێ: رەنگە هەموو ئەوانەی من لێرەدا گوتم وەک درۆودەلەسە وەریانگری، چەشنی ئەوەی پیرەمێردەکان دەیگێڕنەوە، چ سەنگێکی بۆ دانانێیت". دووبارە دەڵێ:" کەواتە بڕوا بێنە بەو مێژووەی دام بە گوێتدا".

ئەم گومانانە زۆر رەوایە، گومانی خودی ئەفلاتۆن بوو بێ، لەمبارەدا دۆزەخەکەی کۆمەڵە ئەفسانەیەک تۆمار دەکات، کە لە ئامادەسازییەکی هوشیارانەوە رێکخراوە بۆ پشتیوانیکردنی هێڵکارییەکی کۆمەڵایەتی-سیاسی.

کاتێ لە گفتوگۆی فیدۆن دەچێتەسەر باسکردنێ بێسنووری تۆڕەکانی ئاوی دۆزەخ، لەسەر پشکنینی وردی ئەم شوێنە ژێرزەمینیانە دەوەستێ، لە دەورانێکدا کە زۆرترین رەوتی فەلسەفی، گرەوی لەسەر گەورەترین خۆپاریزی لەو مەسەلەیە کردووە، سەختە بڕوا بە دڵسۆزییەکەی بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا شوێنکەوتەکانی ئەفلاتۆنی نوێ، دێن و شایەتی لەسەر ئەم جەختکردنەوانە دەدەن. لە سەدەی سێ ئەفلۆتین[٥٢] چەمکێکی رۆحانیتر ئامادە دەکا، کە چەمکی هیندۆسییەکانمان بۆ دۆزەخ وەبیردێنێتەوە. بەلای ئەوەوە دۆزەخ لەگەڵ دۆخی گیانێکی پەیوەست بە ماددەوە رێکدەکەوێ.

دۆزەخ" کاتێ گیان لە جەستەدا مەلەوانە، سیخناخە لە ماددە و لەنێویدا نغرۆیە، پاشان کاتێ جەستە جێدێڵێ، سەرلەنوێ دەکەوێتە هەمان قوڕ و لیتەوە، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی روون و رەوان، رووی لەو شوێنە قوڕاوییە وەردەگێڕێ، ئەوە مەرگی راستەقینەیە. تا لەوێ بێت، دەڵێن بەرەو

---

:٥٢لەساڵی(٢٠٥- ٢٧٥)ژیاوە، فەیلەسووفێکی ناودارە و بە دامەزرێنەری ئەفلاتۆنی نوێ دادەنرێت، پتر نووسینەکانی لەسەر میتافیزیکە و کاریگەری زۆری لەسەر فەلسەفە و ئایینەکان هەبووە.

دۆزەخ شــۆڕبۆتەوە و هەر لەوێ دەچێــتە شــیرین خەوەوە Enneades 8,1,IV".

سەبارەت بە ئەفلۆتین لە راستیدا سێ نموونەی تەواوکار بۆ دۆزەخ هەیە: ئەوەی سزا بەردەوامەکان هێناویانەتە ئاراوە، کە لەسەر ئەم زەمینە کێشـەمان بـۆ دروسـتدەکەن، ئەویدیـش لە ئەنجـامی چوونمـان بـۆ نێـو جەسـتەی بـوونەوەرانی نـزم بەرهەم دێـت، ئەوەشـی کە شـەیتانەکان بەهـۆی هەڵە کوشندەکانمانەوە، بەسەریاندا سەپاندووین.

٤-دۆزەخی ڤێرجیلی میللی و شیعری:

یەکەمـین دانراوێکـی گەشـتیاریی زەبەلـلاح، لەبـارەی دۆزەخەوە دوابـێ، ئەلیادەیە، بۆ چەندین سەدەی دیکەش وەک سـەرچاوەیەک دەمێنێتەوە، تا ئەو رادەیەی دانتی لە سەفەرە درێژەکەیدا ڤێرجیللی وەک چاوساغی خۆی داناوە.

بـا قسـە لەسـەر پـوختەی چیـرۆکەکە بکەیـن: ئینـێ مـۆڵەتی لە سـیبیل وەرگـرت، رێـی بدات بـۆ دۆزەخ دابەزێ، بەمەبەسـتی سـەردانیکردنـی بـاوانی ئەنکیـز(Anckise)، رووخسـەت درا بەمەرجـێ هەنـدێ سـرووتی رازیکـارانە ئەنجام بدات. سەفەرەکە پڕ لە سەرکێشی بوو، سـەفەرێکی رەمزی و سیخناخ لە وێنەی هەستیی، کە وایکرد سـەرباری تایبەتمەندییە ئەدەبییەکەی، کتێبەکە ببێـتە نمـوونەیەک، لەدوای خـۆی زۆرێـک لەسـەر ئەو شـێوازە شـوێن پێـی هەڵگرن.

لەرووی جـوگرافییەوە، دەروازەی دۆزەخ دیــاریکراوە: لە زۆنگاوەکــانی ئەکیرۆنە، نزیک لە کـان لە هەرێمـی کامپـانی، گڕکـان لەم نـاوچەیە نائـارامە و دیمەنێکـی خەمۆکییـانەی پـێبەخشـیوە، زۆر ناسـراوە، تـا مـاوەیەکی زۆریـش کونە دەمەکانی دۆزەخ وا دیاریکرابوو کە لەنێوان ڤیزۆف و ئەتنا لە کامپانی یـان لە سـەقلیەدا بـێ، چـوونە نێویشـی لە رێـی ئەشـکەوتەکانەوە دەبـێ، کە بـۆنێکی کاسـکەری لێـوە دەهـات. دوای بەرەوخـوارکەیەکی قـووڵ، رێبـواری

هاتوو دەگاتە نێو دالآنێک، کە بەلا شوومەکان و مژدەدەری دۆزەخی تێدایە وەک: نەخۆشی و برسێتی و هەژاری و جەنگ و ئازار و ویژدان نائاسوودەیی و ترس و زیندان و پرسە و مەرگ و لێکدابڕان. پاشان سێبەری دڕندە و باڵداری ژنە باڵەفڕەکان و دەعەجان و مار و شێرۆن، پەلاماری دەدەن کە پاسەوانانی شوێنەکەن، وای لێدەکەن شەیتانەکان بەو شێوە دەرکەون کە لە خەیاڵدانی مەسیحیەتدا هەیە.

کاتێ ڕێبوارە هاتووەکە دەگاتە کەناری ئەکیرۆن، دەبێ ڕووی قسەی لە ئامادەکار بێ(ئامادەکار ئەو کەسەیە بە بەلەمەکەی یارمەتیی مردووەکان دەدات، تا لە ئەکیرۆن بپەڕنەوە) کە پیرەمێردێکە لە ئەسمال بەناوی کارۆن(Charon). ئەو گیانانەی حەز بە پەڕینەوە دەکەن، زۆرن، بەلام گیانێک کە جەستەکەی نەخرابێتە گۆڕەوە، بۆ ماوەی سەد ساڵ سەرلێشێواو دەبێ، پێشئەوەی بتوانێ بچێتە بەلەمەکەوە. لەسەر کەنارەکەیتر دەبێ سیربیر رام-بکرێ، کە سەگێکی دەعەجانی سێ سەرە.

دادگە بۆ ئەو گیانە شیاوانەی خۆی، رادامانت و مینۆس دادەنێ، بەهاوکاری دادوەرگەلێ کە بەپێی نەریتی ڕۆمانی بەدەنگدان دەستنیشان-دەکرێن. هەروا پۆلێ لە مردووان هەن، تەواوی ئەوانە سەراسیمە دەکەن، کە دۆزەخێ دێننە ئەفراندن: ئەوانیش منداڵگەلێکن لە تەمەنی کۆرپەلەییدا مردوون، لەوێ هەنسک دەدەن، بە یاوەری خۆکوژانێ، کە ژیانێکی باش دەژیان و بەهەڵە سزای مەرگیان بەسەردا سەپێنرا. ئازار و ئەشکەنجە نادرێن، بەلام بەختەوەریش نین، دانیشتوانی مەزرای فرمێسکەکانیش لەوان بەختەوەرتر نین، کە: عاشقە کلۆڵەکان و جەنگاوەرگەلێکن لە شەڕدا کوژراون، ئەوانەی بەهەموو شێوەیەک بێبەخت بوون، ئەوانەش کە بەبێزاری و ئیرەییەوە خەمەکانیان دەگێڕنەوە، هەروەک لە دۆزەخی سۆمەرییەکاندا باوە. بەشێوەیەکی قێزەون قوربانییەکانی ژیان، دوورخراوە و

تەریک دەمێننەوە: لەگەڵ بەختەوەرەکاندا دەرگای بەهەشتیان بۆ ناکرێتەوە، لەگەڵ تیاچووەکانیشدا لە تەرتار حەشر ناکرێن.

لەبەرئەوە دۆزەخ بە مانا راستەقینەکەی لێرەیە، لە قەڵایەکی زەبەللاحی ئاسنین، شورای سێگۆشە، پایریفلیجیتۆن-ی رووباری ئاگر دەورەی داوە، تیسیفۆن-ی پەری پاسەوانی دەروازەکەیەتی، لەم ئەشکەوتەوە هاوار و ناڵە و زرەی زنجیر و گرمە و شڵپەی لێدان بەرزدەبێتەوە. لێرە هیچ مرۆڤێکی پاک ناتوانێت بچێتە ژوورەوە، ئایندەبین ئەشکەنجەکان روون‌دەکاتەوە، کە کڵۆڵەکان رووبەڕووی دەبنەوە، تیتیۆس و تیزیێ و ئەکسیۆن و بیریتۆس چەند نموونەیەکی بەناوبانگی ئەو بارودۆخەن. کەواتە ئەو کارانە چین، بکەرەکانیان وا لێ‌دەکا، شایانی ئەم چارەنووسە بن؟

" ئەوانەن کە بەدرێژایی ژیانیان، براکانیان بوغزاندووە و فێڵیان لە باوکیان کردووە، باوەڕی گەورەکانی خۆیان شێواندووە، ئەوانەی(ژمارەشیان کەم نین) سامانیان جەمکردووە و بۆ خۆیانیان پاشەکەوتکردووە، بەشی خزمەکانیان نەداوە، ئەوانەی بەدەستی زیناکار کوژراون، ئەوانەش لە سوێندشکێنی نەترساون، کە لە بەردەم گەورەکانیاندا خواردوویانە، تەواوی ئەمانە لێرە یەخسیرن، چاوەڕێی سزا دەکەن، هەوڵمەدە بزانی ئەو سزایە چییە".

"سزا بێجگە لە شێوەی بەڵایەک یان بەختێک کە ئەو خەڵکەی فرێ‌داوەتە ئێرە، چیدیکە نییە. ئەوە کەسێکە بە زێر نیشتمانەکەی فرۆشتووە و گەورەیەکی بەهێزی بەسەردا سەپاندوون، ئەویتر بەبڕێ پارە یاسای دارشتووە و هەڵیوەشاندۆتەوە، یەکێتر چۆتە سەر جێگەی کچەکەی و پەردە لێ‌حرامکراوەکەی دڕاندووە. هەموویان بوێربوون لە ئەنجامدانی گوناهی نالەباردا، ئەوەشی ویستوویانە کردوویانە..نا..ناتوانم تەنانەت گەر سەد زمان

و سەد دەم و دەنگم لە ئاسن هەبێ، ناتوانم هەموو جۆری تاوانەکان بژمێرم، ناتوانم هەموو جۆری ئازار و ئەشکەنجەکان بخەمە روو"(Eneide٥٦٠-٦٣٠).

لێکچوون لەنێوان خەتا و سزادانی لە دۆزەخدا، کە یاسای رۆمانی سزای بۆ داناوە، تا رادەیەک سەیرە، بەو جۆرە یاسای سەر دوازدە تابلۆکە بەشێوەیەکی روون ئەوەی قەدەغە کردووە، بڕوای راستەقینەی خوداپێداوەکان بشێوێنرێ. یاسای سزای زیناکار کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧ی پێش زایین، رێ بە مێرد دەدات ژنەکەی و دەنکەکەی بکوژێ، گەر بێتوو بە زەقی لە زیناکردندا بیانبینێ: لەدۆزەخدا زیناکارە کوژراوەکان دەبینین، بەڵام مێردە بکوژەکان نابینین. دیمەنی کۆیلە یاخیبووەکان و یاسادانەرەکان کە یاسایان دادەڕشت و هەڵیان‌دەوەشاندەوە، ئەمە بەشێوەیەکی تایبەتی لە سەردەمی پشێوییەکان لە کۆتایی جەنگی ناوخۆیی، زۆر باو بوو، بۆیە سەیر نییە هەموو ئەوانە لە دۆزەخدا ببینین. دۆزەخێکی کاتیی هەیە: گیانە پاکەکان سەروەختێ لە بەهەشتدا دەبن، دوای هەزار ساڵ پاش ئەوەی شەربەتی بیرچوونەوەیان لە رووباری لیتێ نۆشی، دەگەڕێنەوە و دەچنە پێستی بوونەوەرێ ترەوە.

خەیاڵی ڤێرجیل بۆ دۆزەخ، گەلێ دڵنەوایی بۆ یاساکان لەخۆگرتووە و هاوکات سیخناخیشی کردوون بەروانگەیەکی شاعیریانە، بۆتە یەکێ لە سەرچاوەکانی دۆزەخی کریستیانی کلاسیکی، کە میراتێ دیکەشی وەرگرتووە، ئەویش شوێنکەوتنی جیهانی تەوراتییە.

# بەشی چوارەم
## دۆزەخی تەوراتی و دۆزەخی عیبرانی

ئەو گــرنگییەی لە ئــایینی کریســتیانی تەقلیدیــدا بە دۆزەخ دراوە، زۆرجار بیرکردنەوەیەک دێنێتە ئاراوە، دەبێ دۆزەخ شوێنێکی گرنگی لە جیهــانی تەوراتــی و لە پەڕاوی پیــرۆز داگیرکردبــێ، کە ســەرچاوەی سروش و تیۆلۆژیا و باوەڕە، بەڵام شتی وانییە. چەندە سەیرە دۆزەخ وەک شوێنێ بۆ سزادان لە جیهانەکەی تر، بەتەواوی لە"پەیمانی کۆن"دا بزرە، بەلانی کەمەوە تا سەدەی سێی پێش زایین، واتە تا سەردەمێ دواتر کە هەموو ئاینەکانی‌تر، تێگەیشتنێکی پتەویان لەبارەی دۆزەخەوە لا گەڵاڵە ببوو.

بیرکردنەوە لە ئەگەری هەبوونی سزا سەپێنراوەکانی خودا بەسەر خراپەکاراندا، لەپاش مەرگ، لە سەدەی سێی پێش زایینەوە سەری هەڵدا، ئەویش زیاتر بەهۆی کاریگەریی شارستانییەتەکانی‌ترەوە بوو، وەک لەوەی پێشڤەچوونێکی نێو هزری جولەکە بێت. ئەو کاتەی کریستیانی دەرکەوت، لەناوەنــدەکانی عیبرانیــدا نــاکۆکییەکی زۆر لەســەر ئەم مەسەلەیە هەبوو، کە"پەیمانی نوێ" بێدەنگییەکی زۆری لەبارەوە کردووە. لە ڕێــرەوی دەقێکــی زۆر تایبەتــدا، کە ئەدەبــی خەیاڵیــانەیە، وێــنە یەکەمینەکان لەبارەی شوێنی ئەشکەنجەدان لە ئاگر و ئازاری بێکۆتایی درووستبوون، ئەو وێنانەی کە بەخێرایی لەناوەندە میللییەکاندا، واتا ڕەمزییەکانی خۆیان لەدەست دا و بوونە جەرگەی واقیع.

## ١-چەمكە تەوراتییە كۆنەكان:

رەنگە لەنێو هەموو ئایینەكانی رۆژهەڵاتی نزیكدا و بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ، ئایینی عیبرانییەكان لەهەموویان زیاتر ماددی بووبێ. بەپێی كۆنترین سەفەرەكانی تەورات، وا پێدەچێ هەموو شتێ لەگەڵ مردندا كۆتایی بێت، چونكە گەر شیمانەی ئەوە بكرێ گیانەكان بەرەو شیول[٥٣] بچن، هەروەک لە مەزموری ٦٣دا هاتووە، كە ئەمە جێیەكە لە خواری خوارەوەی زەوییە، ئەوا جیاوازی نێوان ئەم شوێنە و نەبوون، یەكجار كەمە. لەم جێیە داخراوە بە دەرگایەكی قایم، گیانەكان لەنێو تەپ و گەردا راكشاون، بێ جوڵە و بێ هەست و ئاگا، ئومێدی هەستانەوەی تێدا نییە. بەمجۆرە دڵخۆشی بۆ زیندووەكانی تیا بەدی ناكرێت: چ چاكەكار و چ خراپەكار یەک چارەنووسیان هەیە. سەفەری كۆهێلت بەم ئەنجامە دەگات و لەو خەیاڵە خۆی دەرباز دەكات.

" پاش(...) بەچارەنووسی مردووەكان دەگەن.
لەراستیدا، پێشینە بۆ كێیە؟
تەنیا شتێک هەموو كەسێ لێی دڵنیابێت:
ئەوەیە كە سەگێكی زیندوو لە شێرێكی مردوو باشترە.
چونكە زیندووەكان دەزانن كە دەمرن
بەڵام مردووەكان هیچ شتێک نازانن
چ ئومێدێكیان بۆ پاداشتكردن نییە.
لەبەرئەوەی یادگارییەكانیان چوونەتە خانەی بیرچونەوەوە

---

٥٣ : وشەیەكی عیبرییە و بۆ وەسفكردنی مەملەكەتی مردووەكان بەكاردێت، ماناكەی شوێنی مردووان دەگەیەنێ یان ئەو شوێنەی كە رۆحەكانی تێدایە، لە ئینجیلدا ئەم وشەیە بەرانبەر بە وشەی(هەڵدێر) دێتەوە كە شوێنێ كاتییە و تێیدا رۆحەكان چاوەڕێی رۆژی حەشر دەكەن.

ئەڤینداری و رکوکینە و ئیرەییان، هیچی نەما
چ پشکێکیان لەوەدا نەماوە کە لەژێر خۆردا روودەدا" (۹,۳-٦)، لەسەر زەوی خودا سزای خراپەکاران دەدات، یەکەم بەشێوازی دەستەجەمعی، وەک داگیرکردنی بێگانە و سوکایەتی پێکردن و رشانەوە و برسێتی و پەلاماردان لەلایەن ئاژەڵی دڕندە، لە دەسپێکی سەردەمی پێغەمبەرانەوە لە سەدەی هەشتی پێش زایین، سزاکان دەگۆڕێن بۆ تاکەکەسی و بەزەمینیەکی پەتییش دەمێننەوە. بەڵام دادوەری بەدابڕاوی لە واقیع مایەوە، خراپەکاران تووشی جۆرەها کارەسات هاتن، بەگرتنەبەری ڕێسای(چاو بەرانبەر بە چاو و ددان بەرانبەر بە ددان). ئەو گوناهانەی سزایان هەیە، گوناهی ئاینی و سرووتی و کۆمەڵایەتین وەکو پەرستنی بتەکان، پێشێلکردنی پیرۆزییەکان یان پێشێلکردنی دەقەکانی ئاینی موسایی.

هێڵە یەکەمینەکانی بیرۆکەی دۆزەخ لەپاش مردن زۆر درەنگ دەرکەوتن، لە سەفەری ئەشعیا دوو بڕگە هەیە کە هەمیشە ئەم درەنگ هاتنەی وا داناوە:

لەبەرئەوەی ئەو یاهووە[٥٤] دێت و ئاگری پێیە، خلۆکەی گالیسکەکەی وەک گەردەلولە، تا تووڕەیی و کڵپەی ئاگری هەڵڕێژێت، لەبەرئەوەی یاهوو بە ئاگر سەرکۆنەی هەموو خەڵک دەکات(٦٦، ١٦-١٥) " بەچوونە دەرەوەیان جەستەی خەڵکانێ دەبینن کە لەمن یاخیی بوون، چونکە کرمیان نامرێت و ئاگریان خامۆش نابێت، دەبنە ئەفەرۆز بۆ هەموو مرۆڤ(٦٦، ٢٤).

لێکدانەوەی هاوچەرخانە وای دادەنێت کە ئەم دێڕانە مانایەکی ماددی پەتی و دنیاییان هەیە: جەستەی دوژمنەکانی ئیسرائیل لەبەریەک

٥٤ : یەکێکە لە ناوەکانی خودا کە لە تەوراتدا هاتووە.

هەڵدەوەشــێت و کــرم دەیخــوات، ئەم خواستنە(ئیســتیعارە) بەمانــای تێکچــوون دێــت، یــان ئــاگر لە دۆڵــی هینــۆم لە دەرەوەی ئۆرشــەلیم هەڵیدەلوشێت. ئاگر ماددەیەکی رەمزییە و مانای تووڕەبونی خودابیە کە کافرەکان لەناودەبات: مەزموری ٨٩ پرسیار دەکات و دەڵێت" تاکەی ئەی یاهوو تووڕەبوونت وەک ئاگر جۆش دەدات؟". لە پەڕاوی پیرۆزدا ئاگر وەک ئامرازێک بۆ پاکژبوونەوە ٢٧١ جار بەکارهاتووە.

ئەو بیـرۆکەیە کە لە سـەردەمی پێغەمبەرەکانـدا پێشـکەوت، بەڕوونـی بیرۆکەی بەرپرسیارێتییەکی کەسییە. حەزقیال لە فەسڵی هەژدەدا دەڵێت" ئەوەی هەڵە دەکـات، هەر خـۆی دەمرێـت. کـوڕ بـاجی هەڵەی بـاوک و بـاوکیش بـاجی هەڵەی کـوڕ نـادات". لەگەڵ ئەوەشـدا دەبێـت چـاوەڕێی سـەدەی پێـنجەم بکرێـت بـۆ ئەوەی ورووژانـدنی مەسـەلەی پڕەنسـیپی دادوەریــی جێگیــر بە کەمــێ شــەرمەوە ببینــین. ئایــا ئەمە لەئاکــامی داگیرکردنی فارسەکان و نزیکبوونەوەیان لە زەردەشتی و بیروباوەڕی رۆژی دواییـانەوە بـووە؟ نـازانین: سـەفەری ئەیـوب لە کۆتـایی سـەدەی پێنجەم مەسەلەی چاکەکار وەڕوو دەخات کە تووشی کارەسات دەبێ و خراپەکـاریش کە سـەرکەوتن هـاودەمیەتی، لەکـاتی مردنـدا هەردووکیـان یەک چارەنووسـیان هەیە" پـێکەوە لەسـەر تەپوتـۆز رادەکشـێن و کـرم دایـاندەپۆشــێ". لەســەدەی دواتــردا لەمیــانی کودەتــا گەردوونییەکــان، پێغەمبەر یوئیل قسە لەسـەر ئەگەری قیامەت لە کۆتـایی جیهانـدا دەکـات، کە ئەمە پــێش جیــاکردنەوەی چاکەکــاران لە خراپەکــاران و شــێوازی سـەفەرەکانی خەیـاڵ دەکەوێـت، بەڵام ئەو سـەفەرانە جـگە لە خەیـاڵێکی تەمومژاوی چیدیکە نین.

نزیکبوونەوە لە دنیای هێلینستی[55] بیرۆکەی ئاوێتەبوونی بە جیهانی پەتلەسی[56] و سلۆکییەکانی[57] دەبزوانـد، کە هاوکـات بـوو لەگەڵ سەرەتای هێرشەکانی ئەسکەندەر لە ساڵی ۳۳۱ی پێش زایین، تێبینی دەکرێت لەو کەشەدا شیمانەکان زۆر دەبن، کە تۆقاندنی ئایینی و گەڕان بەشوێن رزگاربووندا، تایبەتمەندێتی رۆژهەڵات لەو سەردەمەدا شوناس دەکات: ئاینە خاوەن نهێنییەکانی وەک پەرستنی سیبیل یان ئورفی، رکابەریی ئایینە گەورەکانیان دەکرد، کە بەڵێنی بەختیارییەکی هەمیشەییان بە شوێنکەوتوانی خۆیان دەدا و مژدەی تۆقاندنیشیان بەوانیتر لە حەشرە چاوەڕوانکراوەکە دەبەخشییەوە. جیهانی جولەکە زۆر هەستیارانەتر بەرانبەر کاریگەرییە دەرەکییەکان کە بۆ ماوەیەکی

---

٥٥: سەردەمێکە لە مێژووی دێرین کە لەدوای مردنی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە لە ساڵی ۳۲۳ی پ.زایین دەست پێدەکات و نزیکەی دووسەد ساڵ دەخایەنێت. ئەو سەردەمە کلتووری یۆنانی زۆر رووی شارستانییەتی لەخۆگرتبوو. ئەم زاراوەیە بۆ جیاکردنەوە لە ماوەی هێلینی بەکاردێت، کە سەردەمی گریکە کۆنەکانە و بەوە ناسرابوو کە شەپۆلێکی فراوان لە خەڵکی یۆنان بەرەو دەرەوەی سنووری یۆنان بڵاوبوونەوە بەرەو ئاسیا و ئەفریقیا. ئەم زاراوەیە لەلایەن مێژوونوس(ج.ج. درویسین)ـەوە درووست کرا.

٥٦ : پەتلەسی خانەوادەیەکی لە بنەچەدا مەکدۆنین و لەمردنی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە بەرەو میسر بەڕێ کەوتوون، ئەو کاتەی پەتلیمۆسی یەکەم یەکێک بوو لە فەرماندە سەربازییەکانی سوپای ئەسکەندەر، دوایەمینیشیان خاتوو کلیۆپاترا بوو لەگەڵ کوڕەکەی پەتلیمۆسی پازدە، باڵادەستی ئەم خانەوادە فەرمانڕەوایە گەیشتە فەلەستین و قوبرس و رۆژهەڵاتی لیبیا.

٥٧ : بەشێکن لە وەچەی هلنستی و ناوەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەری دەوڵەتی سلۆکی(سلۆکسی یەکەم نیاکتۆر) کە یەکێ بوو لە فەرماندەکانی سوپای ئەسکەندەری مەکدۆنی، ئەم دەوڵەتە پاش مردنی ئەسکەندەر دامەزرا لە سەدەی دوو و سێی پێش زایین، توانی دەسەڵات بەسەر ناوچەکانی رۆژاوای ئاسیادا بکێشێ و درێژبێتەوە بۆ سوریا و تا هیندستان بڕوات. سلۆکییەکان هەمیشە لە مێژوودا بە دوژمنی رۆمانەکان ناوبراون.

زۆر بڕوایان پێی نەبوو، بەشدارییان کرد، بەشدارییان لەو وێناکردنانە کــرد بەتــایبەتی لە ناوەنــدە بــێ شــیرازەکانی وەک ئەســکەندەرییە، کە ئایینەکان شان بە شانی یەکتری دەژیان و لەنێو دۆخێکی زۆر ماددیشدا، وەک دۆخی تیۆدۆری بێباوەڕ، هاوکات ڕەوتێکی ئەپیکۆری بەهێز بەم ڕستەیە گوزارشتی لەخۆی دەکرد( من نەبووم، دواتر لەدایکبووم، پاشان ژیام، ئەوجا نەمام: ئەمە هەموو شتێکە. گەر هەر کەسێک پێچەوانەی ئەمە بڵێت، ئەوە درۆزنە).

٢- دڵەراوکێــی عیبرانییەکــان لەهەمــبەر بیــرۆکەی دۆزەخ(ســەدەی سێ- سەدەی یەکی پێش زایین):

جیهــانی عیبــری لە وەرگرتنــی بیــرۆکەی دۆزەخــدا، هێــواش بــوو... لەســــەدەی ســــێی پــــێش زایــــین ســــەفەری گــــردکەرەوە کە لە ژێــــر کــــاریگەرییەکی زۆر تونــــدی فەلســــەفەی یۆنانیــــدا بــــوو، بەمشــــێوەیە گوزارشت لە ڕەشبینیی خۆی دەکات: هەموان تووشی بەڵا دەبن، یەک کارەسات ڕووبەڕووی هاوڕێ و دووڕوو دەبێتەوە، یەک کارەسات بۆ مرۆڤی باش و پاک و پیس، بۆ سەربڕاو و سەرنەبڕاو، بۆ مرۆڤی چاک وەک خەتاکــارە، ئەوەشــی ســوێند دەخــوات وەک ئەوەیە کە خــۆی لە سوێند دەپارێزێت.(٩،٢). سەفەری ئیبن سیراخ[٥٨] لە سەدەی دوو-دا، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە تەنیا سزایەک بۆ خراپەکار لە ژیاندا دەبێت، ئەویش بە سەپاندنی دادوەرییەکی جێگیر، ئەگینا لە پاش مردن شتێک نییە لێی بترسین: ( دە ساڵ بژیت یان سەد ساڵ یان هەزار ساڵ لە دۆزەخدا بژیت، لە دۆزەخدا چ حیسابێک بۆ تەمەن ناکرێت) (٤١، ٣-٤). بەڵام ڕووداوە سیاسییەکان بۆ ئەوە دێن بیرۆکەیەک بورووژێنن و

---

٥٨ : کارێکە لە سەدەی دووی پێش زایین بە زمانی عیبری نووسراوەتەوە و ناسراوە بە حیکمەتی یوشع بن سیراخ یان حیکمەتی ئیبن سیراخ.

گومان بخەنە سەر چەمکی تەقلیدی، لەگەڵ ستەمکاریی پادشای سلوقی ئەنتیۆخۆسی چوارەم(١٦٤- ١٧٥) کە ئایینی جولەکەی قەدەغە کرد و هەوڵیدەدا فەڵەستین بەزۆرەملێ بەرەو هێلینی بەرێت، شۆڕشێک بە سەرکردایەتیی خانەوادەی مەکابییەکان بەرپا دەبێ و جەنگی قارەمانانە ئەنجام دەدەن، بەڵام هیچ سەرکەوتنێک بەدەست ناهێنن بۆ رزگارکردنی میللەتی عیبرانی. ئایا ئەم دەردەسەرییە زەمینییە کە تایبەت بوو بە سەرکەوتنی دوژمنەکانی میللەتی ئیسرائیل، بەڵگەی ئەوە نییە کە خودا زەمەنی پاداشتدانەوە بۆ کۆتایی جیهان دوا دەخات؟ ئەمە ئەو بیرۆکەیە بوو کە لە ئەدەبێکدا بەناوی ئەدەبی روئیا کە لە وشەیەکەوە سەری هەڵدا مانای(سروش)ی دەبەخشی. ئەم ئیحایانە رووکەشانە لەسەر زاری کەسێک لە رابردوو دادەنرا و رووداوە مێژووییەکانی دەگێڕاوە، کە پێشتر روویانداوە و شاهێدی دێناوە بۆ راست و درووستیی قسەکانی. نامەیەکی نهێنی بە زمانێکی هێمادار لەبارەی سزاکانی دوایی مرۆڤ، پشت بەستوو بە سەراوژێربوونەوەی گەردوونی کە وێنەگەلێکن هەڵگری مانایەکی شاراوەن. ئەمجۆرە ئەدەبە، کە بەسەر سەردەمی بەڵا و ستەمگەرییدا دەچەسپێت، هەتا سەدەی دووەمی زایین بەردەوام دەبێت، خوێندنەوەی، پێویستی بە زانینی هێماکان و زاراوەکان بوو کە زۆرجار بەسەرماندا تێدەپەڕین، مانای تەمومژاوی هەندێ وشەی ئیستیعارەیی بە خێراییەکی بێئەندازە لێمان بزر دەبوو، وای لێدەکردین گەر تەنیا وێنە و هێما نەبوونایە، لێکدانەوەیەکی دەقاودەقمان بۆ دەکرد، ئەمە حاڵی هەموو ئەو وێنانە بوون کە بۆ نموونە مانای"ئاگر"یان دەدا.

سەفەری دانیاڵ دەکەوێتە ئەم رەوتەوە کە لە ساڵی ١٦٠ی پێش زاییندا نووسراوە، هەم بۆ جاری یەکەمیش بە روونی قسە لەسەر دۆزەخی هەتاهەتایی دەکات" ئەو کاتەی یەک میللەت بوون کات وا تەنگ

نەبوو، لەو سەردەمە میللەتەکەت، هەر کەسێکیش کە لە پەڕاوەکە ناوی نووسراوە، دەرباز دەبوو. زۆرێک لەوانەی لەژێر خاکدا راکشاون، هەندێکیان بۆ ژیانی هەتا هەتایی بێدار دەبنەوە و هەندێکیشیان بۆ شەرمەزاری و تۆقینی یەکجارەکی"(١٢، ١-٢).

بەڵام ئەم بیرۆکەیە زۆر لەوە دوورترە کە کۆدەنگییەکی لەسەر بێ: لەسەفەری مەکابییەکانی دووەم بۆ نموونە دەبینین، تەنیا سزایەک کە ئەنتیۆخۆسی چوارەم رایگەیاندووە سزای زەمینییە: کارەسات، مردنی جەرگبڕ، داتەپینی کڵۆڵانە. لەدوایەمین سەفەری مزگێنی کۆندا واتە سەفەری پیتۆڵیی، کە لەدەوروبەری ساڵی ٥٠ی پێش زایین نووسراوە. هێشتا لیستی درێژی ئەشکەنجەکان کە تووشی خراپەکاران دەبن، مانایەکی زەمینییان هەیە، لە سەردەمی مەسیحدا بەپێی گوتەی مێژوونوس فلاڤیۆس، سێ بۆچوونی جیاواز لای جولەکە جیادەکەینەوە:

یەکەم سدوقییەکان[٥٩] ئەوانەی سەر بەناوەندی ئەرستۆکرات و قەشەکانن، وادەبینن کە مردن هەموو تاکەکەسێک دەگرێتەوە، بەڵام دۆزەخ بوونی نییە. دووەم فەریسییەکان کە ناوەندێکی بڕوادار و خوداپەرستی جوێبۆوە لە چینەکانی ناوەڕاست پێکدێنن، بڕوایان وایە کە بەدڵنیاییەوە رۆژی دوایی و سزا لە جیهانەکەیتر بوونی هەیە،

---

٥٩ : بەشێکن لە ئاینی جولەکە، چینێکی ئەریستۆکراتی نێویانن، بەڵام خاوەن تێروانینی تایبەت بەخۆیانن، ئەمانە تەنیا باوەڕیان بە پێنج سەفەر(هاومانای سوورەتە لە قورئانی پیرۆز)ی تەورات هەبوو، کە راستەوخۆ لە حەزرەتی موسا وەرگیراون، بۆیە تەواوی ئەو سەفەرگەلەیان رەتکردبۆوە کە جولەکە بڕوایان پێیبوو. هاوکات ئەمانە بڕوایان بە هەستانەوەی مردوو و ژیانی هەتاهەتایی پاش مەرگ نەبوو، دانیان بە فریشتە و شەیتاندا نەدەنا، لەبەرئەوە ناویان لە پێنج سەفەری یەکەمدا نەهاتووە، بەڵکو زیاتر پابەندبوون بە لۆژیک، لەمەشدا لەگەڵ کۆمەڵەی فەریسییەکان رکابەری تەقلیدی یەکتری بوون، بەردەوام دوژمنایەتی و ململانێ و گەنگەشەیان بووە، کە لە لاپەڕەکانی دواتردا ناویان دێت.

سـزاکانیش لە شـێوەی ئەشـکەنجەداندایە، بەڵام ئەم بـڕوایە ورد و ڕێک نییە، هەندێجار تێکەڵ بە بیرۆکەی دۆنادۆن دەبن. کەچی ئەسینییەکان کە لە سـەدەی دووەمـی پـێش زایـین سـەریان هەڵـدا، کـۆمەڵەیەکی پەرتوبڵاویـان پێـکهێنـابوو، بەتـایبەتی لە سـارایەکی نزیـک لە دەریـای مردوو، بەڵام زیاتر میتۆدی بوون. مێژوونـوس یوسیفۆس نووسیویەتی و دەڵێـت: ئەسـینییەکان بەخۆیـان بڕوایـان وایە گیانەکـان بە نەمـری خوڵقاون تا هەوڵ بۆ چاکە بدەن و لە خراپە دووربکەونەوە، بارودۆخی چاکەکاران لەم ژیانەدا باش نەبوو، بەو ئومێدەی لەپاش مردن بەختەوەر بـن، ئەو خراپەکـارانەی وا تێـدەگەن کە توانایـان هەیە لەم جیهـانەدا خراپەکانیـان بشـارنەوە، لە دنیـاکەی‌تر بە ئەشـکەنجەیەکی هەتـا هەتـایی لەسـەر ئەو خراپانەیـان سـزا دەدرێـن. " ئایـا یۆحەننـای مەعـمەدان[٦٠] و یەسوعی مەسـیح لەنێو ئەم کۆمەڵانەدا پەیدابوون؟" گفتوگۆ لەسـەر ئەم مەسەلەیە هێشتا بەردەوامە، بەڵام هەندێ بەڵگەی سەرسـامکار هەروەک هەندێ کۆپلە لە دەستنووسەکانی دەریای مردوو، کە هەر جارە و شتێک لەناوەرۆکەکەی ئاشکرا دەبێت، بیرکردنەوە بەرەو ئەو مەسەلەیە دەبات. بەڵام جیهانی جولەکەی ئەرتۆزکسی لەسـەرخۆ تێڕوانینی خۆی لەسـەر دۆزەخ دادەڕێژێت.

---

٦٠ : یۆحەننا یان یەحیا کە بەپێی ئینجیل لەدایک و باوکێکی بڕوادار لەدایک بووە، ئەویش زەکەریای کاهین و ئەلیساباتی هاوسەری کە هەردووکیان دەچنەوە سەر ئەسباتەکان، زەکەریا بە پێغەمبەری ئایینی سابیئەی مەندانی دادەنرێ، یۆحەننا یەکەمین کەس بووە کە تەعمیدی حەزرەتی عیسای کردووە، واتە ئاوی لە سەری راداوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە پاکی دەکاتەوە و ئامادەی دەکات بۆ وەرگرتنی رەزامەندی خودا لەسەر ئەم بوونەوەرە و بەو پێیەش کە ئاو سەرچاوەی بوونە و پاکژکەرەوەیە، بۆیە ئەو ئاو بەسەردا کردنە لەنێو ئایینی کریستیانیدا بە تەعمید ناودەبرێ و ئەوەشی بەو کارە هەڵدەستێ بە مەعمەدان ناودەبرێت.

### ٣- دۆزەخی خودایی و دۆزەخی تەلمودی:

ئەدەبی هەڵبەستراوی[٦١] جولەکە بوو بۆ یەکەمینجار لە سەفەری ئەخنۆخ، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی پێش زایین، بڕەوی بە بابەتی دۆزەخ دا. لەوێڕا پەتریارک ئەخنۆخ دەبینین، کە فریشتە بەرەو جیهانەکەیتری دەبا و رووباری ئاگر و چیای تاریکی دەبڕێت، دەگاتە دەروازەی دۆزەخ کە هەڵدێرێکە روو لە رۆژاوا و نزیک لە گڕی هەڵچووی ئاگری ئاسمان. لە ناوەوە لە شێوێکی تەسک، دوو جۆر مردوو چاوەڕێی ئەشکەنجەن: ئەو گوناهبارانەی بە کڵۆڵی ژیاون، ئەشکەنجەیەکی سووک دەدرێن، گوناهبارگەلێکیش کە بەختەوەرانە ژیاون، ئەشکەنجەکانیان بۆ هەتا هەتایە.

دوو سەفەریتر هەیە کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی یەکەمی پێش زایین، لەسەر هەمان بیرۆکە چڕبوونەتەوە کە ئەوانیش: سروودەکانی سلێمان و بەتایبەتیش خەونەکانی باروخ، دەقە خواوەندییەکە، کە نوقڵانە بۆ کۆتایی جیهان لێدەدات و دەشبێتە بینەری حەشری خراپەکاران لە ئاگردا:" ئەم هەمووە بە هیلاک دەچن،

---

٦١: یان نووسینی ساختە یان زاراوە ئینگلیزییەکەی(apocryphe) بەو نووسینانە دەگوترێت کە بە شێوەیەکی راست و ورد نەهاتوون و نەگەیشتوونەتە دەستمان، لەنێو کریستیانیدا هەر هەواڵ و بابەتێک لە رێگەی پەیامگەیەنەرەکانەوە نەگەیشتبێت بە راست و یاسایی دانانرێت و بە ساختە ناوبراوە، بۆیە لەمبارەوە(٢٢) ئینجیل بە هەڵبەستراو دادەنرێن، لەمبارەوە پێوەر هەیە بۆ ناسینەوەی ئەمجۆرە نووسینانە، لەوانە هەندێک نووسین باس لە کاروباری سەرسووڕهێنەر دەکەن کە لەگەڵ چوار ئینجیلەکەدا یەک-ناگرنەوە، بۆ نموونە کاتێک دەگێڕنەوە کە حەزرەتی مەسیح رفێنراوە، ئەمە بە نووسینی هەڵبەستراو و ساختە دادەنرێ، یان هەندێک نووسین دەخرێتە پاڵ یەکێک لە یاوەرەکانی حەزرەتی عیساوە بێ ئەوەی ئەو گوتبێتی، زۆرینەی ئەو جۆرە نووسینانە پاش چوار ئینجیلەکە نووسراون، وەک زیادەیەک بۆ ژیانی بڕواداران و باوەڕەکەیان و شێوازی گوزارشت لێکردن، بەڵام بەگشتی بە نووسینی هەڵبەستراو و ساختە دادەنرێن.

ئەوانەشـی ئـاگر هەڵیـان‌دەلووشـێ لە ژمـارە نـایەن". ئەم کتێبە هەوڵـی کـــارێکی گـــران دەدا، ئەویـــش پێکهێنـــانەوە لەنێـــوان بەرپرســـیارێتی دەســـتەکۆیی هەڵقـــوڵاو لە گونـــاهی بنەڕەتـــی، لەگەڵ بەرپرســـیارێتی تاکەکەسی: " لەبەرئەوەی گەر راست بێت ئادەم یەکەمجار هەڵەی کرد و مەرگـی بـۆ هەمـوو ئەوانە هێنـا، کە هێشـتا لە رۆژگـاری ئەودا لەدایـک نەبوون، بەهەمان‌شێوە ئەوەش راستە کە هەریەکێک نەوەی ئادەم بێت، ئەشکەنجەیەکی بۆ داهـاتووی خۆی ئامـادە کـردووە یـان نەمرییەکـی بـۆ داهاتووی خۆی هەڵبژاردووە...چونکە ئادەم تەنیـا لەخـۆی بەرپـرس بـوو، هەریەکە لە ئێمەش ئادەمی خودی خۆیەتی"(LIV15-19).

لە حەفتاکانی پاش مەسیح سـەفەری چوارەم ئیسـدراس مژدە دەدات کـە ئەوانەی لە شـەریعەت یـاخی دەبـن، حەوت جـۆری جیـاواز لە بەڵا و کارەسـاتیان تـووش دەبـێ، لەو شـێوەیەی لەنێـوان سـاڵانی ٧٠ و ١٣٥دا بەسـەر جولەکەدا هات و لەهەموو رزگاربوونێکی زەمینییانە ئومێدبڕاوی کردن. ئەمە بۆ خۆی بەشداریکردنێک بـوو لە بـرەودان بە بـاوەڕهێنـان بە دادوەریی داهاتوو. لە سـەدەی دوودا هەسـتێکی وا بـاو بـوو، کە لە کـاتی مردنـدا گیـان دەڕوات تـا لە دۆزەخدا(شـیول) ئـارام بگرێـت، لەوێ لەمـاڵە تایبەتەکـانی چاکەکـاران و خراپەکـاران دەمێـنـنەوە و چـاوەڕوانی هـاتنی رۆژی دوایـی دەکەن. لەوکـاتەدا یەکەمینەکـان دەچـنە بەهەشـتی عەدەن و دوایەمینەکـــانیش بەرەو دۆزەخ، کە شـــوێنێکە دەکەوێـــتە رۆژاوا و لە تەلمـــودا وا هـــاتووە کە لە حەوت مـــاڵی یەک لەســـەر یەک پێکهـــاتووە، لەهەموویانـدا هێـزی ئـاگر زاڵە، گـوڕ و تینـی لە هەر خانەیەکـدا لەچـاو خانەکەی خوار خۆی، شەش ئەوەندەی‌تر زیـاد دەکـات: سـەرەڕای ئـاگر، مەینەتـی جۆراوجـۆر هەیە: هـۆڵە تاریکەکـان تەژیـن لە دووپشـک و

هۆڵیشی تێدایە کە بەش مەینەت ناچارە ئەندامەکانی جەستەی خۆی قوت بدات.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم ئازارانە کاتین و ئامانجیان پاکژبوونەوەیە لە گوناهەکان: گیان پاش بەسەربردنی ماوەی ئەشکەنجەدانەکەی، دەتوانێت بچێ بۆ بەهەشتی عەدەن، بێجگە لە گوناهبارە گەورەکان و لەنێویشیاندا گاورەکان، کە قوتابخانە خواوەندییەکان لەبارەیانەوە یەک راوبۆچوون نین: قوتابخانەی شامەی کە زۆر توندە و بڕوای بە" تۆقاندنی هەتاهەتایی" و ئەشکەنجەدانی بێ کۆتایی هەیە، لەکاتێکدا قوتابخانەی هیلێل وای بۆ دەچێت پاش ئەشکەنجەدانەکان کە تا رۆژی دوایی بەردەوامە، لێبوردنی گشتی دەدرێت. هەندێکیش بڕوایان وایە کریستانەکان تیاچووەکانن.

لە هزری جولەکەدا ئەم دوودڵییە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت، کە بایەخێکی زیاتر لە هزری کریستیانی بە ژیانەکەیتر دەدات. فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست نموونەی ئیبن مەیمون تەنیا بەوەندە دەیبڕنەوە، کە جەخت لەسەر تیاچوونی خراپەکاران بکەنەوە.

٤-دۆزەخ لە پەیمانی نوێ:

سەرسامبوونی یەکەم لەخوێندنەوەی پەیمانی نوێ(ئینجیل)دا دێتەکایەوە، زۆر بە دەگمەن باس لە بابەتی دۆزەخ دەکات، کە لە رێنوێنییە سەرەکییەکانیدا تەنیا پێگەیەکی لاوەکی هەیە. گەر تێکستەکان بەپێی سەردەمی دانانیان وەربگرین، دەبێ لە نامەکانی پۆڵسەوە دەست پێبکەین، چونکە لەنێوان ساڵانی ٥٠ و ٦٣دا نووسراونەتەوە، لەکاتێکدا ئینجیلە یەکەمینەکان لەسەرەتای ساڵی ٧٠وە نووسراون. وشەی دۆزەخ لە نووسینەکانی پۆڵسدا تەنیا یەک جار هاتووە، ئەویش بەمانای(جیهانی خوارەوە): " بۆ ئەوەی بەناوی یەسوع هەموو ئەژنۆیەک لە ئاسمان و

زەویدا بەچۆكدا بێت"(نامە بۆ خەڵكی فیلپی ٢، ١٠). پۆڵس هەندێ ئاماژەی بە رۆژی دوایی داوە، كە رایبگەیەنێت هەموو مرۆڤێك بە ئەنجامی كارەكانی خۆی دەگا، بێئەوەی باس لە چارەنووسی خراپەكاران بكات. لە نامەكەیدا بۆ رۆمانییەكان(٢، ٥-١٢) بەتەواوەتی قسەكانی وا دەگەیەنێت، كە تیاچوونی رۆمانییەكان یەكلایی بۆتەوە. ئەم قڕوقپكردنە لای كەسێ كە بە یەكەمین پیاوی ئایینی كڵێسا دابنرێت و رێنماییەكانی سەبارەت بە مەسەلەكانیتر زۆر بەپێز نیشان بدرێت، شتێكی سەیرە.

هەمان بێدەنگی لای پەترۆسیش تێبینی دەكەین، لە نامەكەی یەكەمیدا كە لە ساڵی ٦٤دا نووسراوە، بە وردی باس لە جیهانی دووەم دەكات، بەڵام یەك وشە لەبارەی دۆزەخەوە ناڵێت. ئەو بڕگەیەی لە نامەی دووەمیدا باس لە تەرتار(٢،٤) دەكا، تەنیا زیادەخستنەسەرێكی ساختانەی سەدەی دووەمە. هەمان قڕوقەپكردنەكە لە كاری یاوەرانی مەسیحدا كە لە دەوروبەری ساڵی ٨٠ نووسراون، دووبارە دەبنەوە.

تەنیا خواپەرستییەك كە لای پۆڵس دەیبینین لە(رۆمانییەكان ١٠،٧ و خەڵكی ئەفسس ٤،١٠-٨)دایە، لای پەترۆسیش لە(٣،١، ١٩-٢٠) باس لە دابەزینێكی شیمانەكراو دەكەن، كە لەنێوان هەینیی مەزن و یەكشەممەی قوربانی، یەسوع پێی هەستاوە بۆ شانشینی مردووەكان. هەموو جارێكیش دەستەواژەكان بەشێوەیەكی تەمومژاوی دەگوترێن، كە تێیدا وشەی دۆزەخ ناوی نەهێنراوە، ئەمەش بەزۆری وا دەگەیەنێت كە یەسوع چووە، مردووە باشەكان كە پێش هاتنی ئەو مردوون، رزگاریان بكات. لەگەڵ ئەوەشدا دەستەواژەی(دابەزین بۆ دۆزەخ) كە بووە بەكارهێنانێكی فەرمی، بۆ یەكەمینجار لە ساڵی ٣٥٩دا دەركەوت لە" دارشتنی چوارەمی سیرمیۆم" دانانی مارك داریتۆز. "هێمای پەیامبەر"ی

لێوە پێچا کە کورتکراوەی باوەڕێ بوو لە سەدەی ٥ لە گالیا و ئیسپانیا هاتە کایەوە و لەسەدەی ١٠ش برایە رۆما.

لە بەرانبەردا ئینجیلەکان بە وردەکارییەکی زیاترەوە قسە لەسەر دۆزەخ دەکەن. جیاوازییەکە لەگەڵ رێنماییەکانی پۆڵس لەمڕووەوە جێی سەرسوڕمانە، ئەمە دووبارە مەسەلەیەک دەورووژێنێت کە هەندێ لە راڤەکاری دەستنووسەکانی دەریای مردوو، بەمدواییە بەزۆرێک لە وێکنەهاتنەوەی نێوان پۆڵس و مەسیح لەبارەیەوە دواون. دەبێت ئەوەشمان لەیاد بێت کە ئینجیلەکان بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی دەستەکۆیین لەنێو کۆمەڵە یەکەمینەکانی مەسیحییەتدا، کە هەڵگری رۆحی ئەسینی بوون، لەدوای کارەساتی رووخانی ئۆرشەلیم لە ساڵی ٧٠ نووسراونەتەوە تا هزری خەیاڵدانیی پتەو بکات.

دۆزەخی ئینجیل تا رادەیەک هەمیشە جەهەنمە(Gehenne) کە شوێنێ هەستپێکراوە. "دۆڵی گریان" یان" Gi-Hinnom" شوێنە نەفرەتلێکراوەکە، شوێنی یەکێ لە پەرستگە دێرینەکانی کەنعانییەکانە، کە پێشتر بۆ بتە خواوەندەکان، ئاسکێک رەنگە لەگەڵ هەندێ مرۆڤیش بکرانایە قوربانی. ئیتر ئەم شوێنە پاش گەڕانەوە لە دوورخرانەوە، ببووە کوورەیەکی فراوان، بەردەوام پاشماوە و پاشەڕۆی ئاژەڵی تێدا دەسووتێنرا، کە ئاگر و سکڵ لووشی دەدان. لێرەدا مەرقس وا گوزارشت دەکات" گەر چاوەکانت گومانیان کرد، دەریان بێنە، باشترە بۆت بەکوێری بچیتە نێو مەلەکوتی خوداوە نەک چاوت بە دۆزەخ بکەوێ، سکڵ نامرێ و ئاگریش خامۆش نابێت(٤، ٤٧-٤٨) ژیلەمۆ و ئاگر بەخێرایی دەبنە دوو توخمی سەرەکی لە دۆزەخدا".

مەتا لەهەموان زیاتر لەسەر ئەم بابەتە فرەوێژی کردووە: لەوێ گریان و چیرەی ددانەکان دێت.(٨،١٢) ئەم رستەیە شەش جار دووبارە

دەبێتەوە، سێ جار باس لە"تاریکی چین لەسەر چین" سێجاری دیکەش لەسـەر ئـاگری هەتاهەتـایی. هەروەهـا باسـی(دەرگاکانی دۆزەخ) و (دۆزەخی ئاگر)یش دەکا، لۆقا لەلایەن خۆیەوە چیرۆکی ئەلیعازەر و دەوڵەمەنـدە شـەڕانییەکە دەگێـڕێتەوە(١٦، ١٩-٣١) کە بـریتییە لە گفتوگۆیەکی فێرکارییانە هەروەک لە میتۆلۆژیای میسریدا دەیبینین: دەوڵەمەندە شەڕانییەکە پاش مردن، دەچێ بۆ شوێنی ئەشکەنجەدان، بەهۆی ئاگرەوە ئازار دەچێژێت، داوای دڵۆپێک ئاو لە ئیبراهیم دەکات، بەڵام نایداتێ. لۆقا چەند تێبینییەک لەبارەی ژمارە کەمە رزگاربووەکان دەخاتە سەر ئەم چیرۆکە ئامادەکراوە بەمەبەستی کێشکردن بەرەو ئایینە نوێکە: کۆشش بکەن تا لە دەرگا تەسکەکەوە بچنە ژووری، چونکە زۆرێک هەوڵدەدەن و ناتوانن.

بەڵام نووسینەکانی یۆحەننا لەوانەش خەونەکانی کە لە دەوروبەری ساڵی ٩٥ نووسراونەتەوە، بە کۆتاییەکی مێژوویی بۆ کارەکانی پەیمانی نوێ دادەنرێت، ئەم ئەدەبە تایبەتە وا پۆلێن دەکرێت، کە ئیستیعارەیەکی بەتینی لەخۆگرتووە. "خراپەکاران لەبەردەم فریشتە پیرۆزەکاندا لە ئاگر و گۆگرددا ئەشکەنجە دەدرێن. دووکەڵی ئازارەکانیان بۆ ساڵەهای ساڵ بەرز دەبێتـەوە، نە رۆژ و نە شـەو پشـوو نـادەن"(١٤، ١٠-١١). لەوێ" دەریاچەی ئاگر گۆگردی تێدا دەسووتێ". دیداری نێوان رزگاربووان و تیاچووان، رووخساری نەگۆڕی نموونەی ئەسینییە:

رێنماییەکانی پەیمانی نوێ کە بە گشتی باس لە دۆزەخ دەکەن، زۆر تەمومژاوی و سەرلێشێوێنەرن، پەیمانی نوێ هەندێ لە رەگەزەکانی لە رێبازی خەیاڵی و ئەسینییەکان و دۆزەخی زەمینی و ئەو شڵەژانەی دوای کەوتنی ئۆرشەلیم هات، وەرگرتووە. ئەمەش وێنەیەکی نمونەییە لە ئەقڵیەتـی دەسـتەیەکی کەم، کە رووبەڕووی ئەوانە دەبـنەوە لە هەر

چــوارلاوە دوژمنکــارانە لێیــان دەڕوانــن، هەروەک چــۆن بەگــژ دۆخە نســکۆییەکاندا دەچــنەوە، ئەم دەســتە بچــووکە لە"هەڵبژێردراوەکــان" پەرۆشن بۆ پاداشتێکی گەورەی یەکلاکارانە.

هەرچۆنێ بێت دۆزەخ تەنیا بۆشاییەکی بچووکی گرتووە، لەدۆخێکدا دەمێنێــتەوە کە هەســتێکی تەمومــژاوی و هەڕەشــەیەکی شــیمانەکراو بەســەریدا زاڵە. ئینجیلیــیەک نیــیە دڵنیــابێ کە یەهــودای سەردەســتەی ناپاکەکــان لە تیاچووەکــانە، ئەو لە نەریتــی هەنــدێ کەســدا خــۆی خنکانــدووە. بــۆ خەڵکێکــی دیــکەش قوربــانییەکی بێچــارەی کەوتــووە، هەرچۆنێ بێ چارەنووسی بە نادیاری ماوەتەوە.

لەم بنەمــا فشــۆڵانەوە نەریتــی کریســتیانی-میللــی لەلایەک و تیۆلــۆژی لەلایەکەیترەوە، ئەم کۆتەڵە دۆزەخییە زەبەللاحە بونیات دەنێت لەیەک کاتــدا پــێکەوە بــۆ مەبەســتێکی مــۆراڵی و هەم سەرپەرشــتیاریی و ئایدیۆلۆژیی.

## بەشی پێنجەم
## سەرهەڵدانی دۆزەخی کریستیانی

چەمکی دۆزەخ لای کریستیانی سەرەتا لەسەر ئاستی میللی پێشڤەچوونی بەخۆوە بینی. خەیاڵ و نوسینگەلێکی هەڵبەستراو بوون، کە تێڕوانینێکی سەرەتایانەیان بە گەردوونی دۆزەخاوی فرە رەنگ دابوو. کاری فیکر سەری هەڵنەدا، تا قۆناغی دواتر هات، کە باوانی کڵێسا کاریان لەسەر داتای جیاواز و دژبەیەک کرد، بەو جۆرە لەنێو ئەدیبە گەورەکاندا لێکنەچوویی پەیدابوو، هەروەک دەکرا دەقەکانی پەڕاوی پیرۆز بەکار بهێنرێت وەک پاساوێک بۆ بۆچوونە ناکۆکەکان.

لەسەرەتاکانی چاخی ناوەڕاست، ئەوە رەبەنەکان بوون ئاسەواری تێگەیشتنە توندەکانی خۆیان بەسەر دۆزەخەوە جێهێشت، ئەویش بەنووسینی سەرگوزەشتەی گەشتە زۆر و زەبەندەکانی خۆیان بۆ ئەوێ، کە هەندێکیان مۆرکێکی ئیحائیان وەردەگرت. لیستێک لە گوناهەکانیان نوسیبۆوە، کە پێویستە تیاچووان، ئازاری شیاوی خۆیان بۆ دابنرێ.

تیۆلۆژیستانی میتۆدی لە سەدەی ١١ تا سەدەی ١٣، هەوڵی بە ئەقڵانیکردنی هەموو ئەو زانیارییانەیان دەدا و پێکناکۆکەکانیان شرۆڤە دەکرد، کە بە مۆلەقی(هەڵواسراوی) مابوونەوە. وێناکردنەکانیان کورت و پوخت بوو، گەر بەتێڕوانینەکانی پێشوو تەماشا و پەسەندکرابان، تا رادەیەک سەرسوڕمانی دەخستەوە. بەڵام تیۆلۆژیستەکەیان راگەیاندنێکی درێژ بوو بۆ راستییەکانی باوەڕهێنان، کە تەنیا پرەنسیپی دۆزەخی لەخۆگرتبوو، بێئەوەی باس لە وردەکارییەکانیتر بکات.

### ١- دۆزەخ لە نەریتە میللییەکان:

لەنـاوجەرگەی گـروپە درووسـتبووەکانی کریسـتیانیدا، پەرۆشـییەکی زۆر بۆ زانینی ئایندەی خەڵک پەیدابوو، لەنێو بەشێکی گەورەیاندا ئەمە سـەریهەڵدا، لە نـاو خەڵکە سـادە و سـاکارەکەیەوە، لای ئەو پـاکژبووە نوێیانەی تینووی رزگـاری بـوون، لای ئەوانەش کە ژیـانێکی زەمینیی پڕ دەردەســـــەریی بەڕێدەکەن و داوایـــــان لــــێدەکرێـــــت بە ئومێـــــدی هەتاهەتاییەکی بەختەوەرانە، ژیانیان بکەنە قوربانی، لای ئەوانە پێدەچێت پەرۆشـــبوون بـــۆ زانینـــی ئەوەی لە جیهـــانەکەیتـــر چ دەگوزەرێـــت، مەســــەلەیەکی رەوا بێـــت. هەروەهـــا بەلای زۆریشـــیانەوە گـــرنگە چارەنووسـی تیاچووەکـان بـزانن، واتە هەمـوو ئەوانەی بـڕوای راسـت و درووسـتیان نەناسـی و بەژیـانی ئەم دنیـایە خۆشـنود بـوون. حەز بە تۆڵەســـەندنەوە شـــتێکی نـــامۆ نیـــیە بەم خۆهەڵقورتانـــدنە: دەبـــێ ئەو بـڕوادارانەی لەم ژیـانەدا قوربانیـدانی پێویسـتیان داوە، بە ئاینـدەیەکی بەختیار لە رۆژی دواییدا پاداشت بکرێن، ئەوانەشی لەم دنیایەدا بەختیـار بوون، سزا بدرێن. بەختیـاری هەڵبژێردراوەکـان لای زۆرێک لە دانەرانـی وەک ترتلیـانۆس[٦٢] کە گوزارشـت لە هەسـتی مـیللەت دەکەن، بە بینینـی نەهامەتی تیاچووەکان زیاد دەکات.

---

٦٢ : ناوی تەواوی کوینتس سبتیمۆس فلۆرنس ترتلیانۆسە لە قرتاجنەی ئەفریقیا لەدایکبووە لە دەوروبەری ساڵی ١٦٠ی زایینی لە کۆمەڵگەیەکی بتپەرستی و بێباوەڕیدا، باوکی فەرماندەی تیپێکی سەربازیی رۆمانی بوو لە ئەفریقیا، بەڵام ترتلیانۆس ئاستێکی باشی لەخوێندن تەواوکرد و ژیانی خۆی بۆ خوێندنی یاسا تەرخانکرد و دواتر بووە مامۆستای رەوانبێژی لە وڵاتی خۆی. لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا چووە سەر ئایینی مەسیحی، لە دەوروبەری ساڵی ٢٠٢ بۆ ٢٠٥ی زایینی کەوتە نێو بیدعەی مۆنتانییەکانەوە( کەسێ بەناوی مۆنتانیۆس بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کەوا بارکلیتە واتە ئەو کەسەی کە لە ئینجیلدا ناوی هاتووە بەوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی) و بەتەواوی نەزانراوە ئایا گەڕاوەتەوە

بەڵام پەڕاوە پیرۆزەکـان لەبـارەی ئەم ئـازارانەوە زۆر تەمومـژاوین. گەلـێ لە کتێـبە هەڵبەسـتراوەکان و شـێوازە خەیاڵبەنـدییەکان، ئەم بۆشاییەیان پڕ دەکردەوە. ئەم"نووسراوە شاراوانە" کە لە نێوان سەدەی دوو و چـوار تۆمـارکراون، بە کـۆمەڵە ئیحائێـک دەچـن کە تـا ئەم مێـژووەش بە نهێنـی مـاونەتەوە، پەرەیـان پێـدراوە و ئەو خاڵانەشـیان دەستنیشـانکـردووە، کە ئینجیلەکـان بە نادیـاری بەجێیـانهێشـتووە. ئەو نووسـراوانە بە هزرێکـی لێزانـانەوە، سـوور بـوون لەسـەر ڕووبەڕووبـوونەوەی راسـتەوخۆی نێـوان مەسـیح و شـەیتان، لەمیـانی بەیەکگەیشتنەکەیان لە دۆزەخ. ئا بەمجۆرە لە(پەیامی نێردراوەکان)دا کە لەنێـوان هەردوو سـاڵی ١٤٠ و ١٦٠ لە میسـر یـان لە ئاسـیا دانـراوە، یەسـوع دەبینـین بەرەو ئـۆلیمپس شـۆڕدەبێتەوە تـا پیاوچاکـان و پێغەمـبەران پـاکژ بکـاتەوە. ئینجیلـی یەعقـوب کە لە دەوروبەری سـاڵی ١٥٠ی زاینـی نووسـراوەتەوە لەگەڵ ئینجیلـی نیکۆدیمـۆس و ئینجیلـی برتلماوس[٦٣] لەسەر هەمان بابەت قاڵ بوونەتەوە.

---

سەر مەسیحییەت یان نا. ترتلیانۆس بە باوکی زانستی لاهوت یان تیۆلۆژی لە کڵێسای لاتینی دادەنرێت و یەکێکە لە بەرگریکارە سەختەکان لە مەسیحیەت.

٦٣ : لەگەڵ ئەوەی یەکەمی کریستیانیدا، ژمارەیەکی زۆر لە ئینجیل پەیدابوون، بەپێی هەندێ سەرچاوەی مێژوویی ژمارەیان گەیشتۆتە ٧٤ ئینجیل، لەوانە ئینجیلی پەترۆس و ئەندریا و یەعقوب و مەتا و بەرنابا و حەوارییەکان و برتولماوس و نیکۆدیمۆس و مریەمی مەجدەلی و تۆما و یەهودا و مەنا و عیبرانی.. ئەم ئینجیلانە تا سەدەی چواری زایینی دەستاودەستیان پێدەکرا و بەکاردەهێنران، بەڵام لە ساڵی ٣٢٥ی زایینی کۆڕبەندی نیکیێ گەیشتە بڕیارێک کەوا پێویستە تەنیا پشت بە چەند ئینجیلێکی کەم ببەسترێت، لەبەرئەوە کڵێسا فەرمانی دا کە کریستانەکان دەبێت پەنا بۆ چوار ئینجیل بەرن، ئەوانیش ئینجیلەکانی مرقس و یۆحەننا و لۆقا و مەتان. لەبەرئەوە سەرلەبەری ئینجیلەکانی دیکە سووتێنرا و سزاش بڕایەوە بۆ ئەو کەسانەی کە بەکاری دێنن.

له سـەدەی چـوار" کارەکـانی بـیلاتس" بە وردی دابەزینـی مەسـیح بـۆ دۆزەخ دەگێـڕێتەوە، بەشـێوەیەکی سـەیر رەگەزە گریکییەکـانی تـێکەڵ بە رەگەزە کریستیانییەکان کردووە. شەیتان وەک گەورەی شوێنەکە نیشان دەدرێت، بەڵام هادیس بایەخ بەمردووەکان دەدا(پەیمـانی کۆن)- شـەیتان داوا لە هـادیس دەکـات گیـانی مەسـیح بکێشـێت، بەڵام هـادیس دەکەوێتە دوودڵییەوە، چونکە توانای مەسیح گەلێ لە توانای ئەو مەزنترە، چەنـدین جـار گیـانی کێشـاوە و زینـدوو بـۆتەوە. کـاتێ مەسـیح دەگـات، هـادیس فەرمــــــان بەداخســــــتنی دەروازە مســــــییەکانی دۆزەخ دەدا، بەڵام مانـدووبوونەکەی بەهەدەر دەچێت، لەبەرئەوەی مەسـیح دێتە ژوورێ و چاکەکـاران رزگـار دەکـات و شــەیتانیش کۆتوبەنـد دەکـا و رادەسـتی هادیسی دەدا.

نووسینە هەڵبەستراوەکان، لەبارەی سـەفەری رۆحەکـانەوە، چیرۆکە گریکـی و رۆژهەڵاتییەکـانی هێنـایەوە نێـو باسـان. لە چیرۆکی(یوسـفی دارتـاش)[٦٤] رۆحـی لەپـاش مـردن ناچـارە بە یـاوەری شـەیتانەکان گەلـێ بەربەسـت ببڕێت، کە ناتوانێت تێیپەڕێنێت گەر ژیـانێکی پـاک و بـێگەرد نەژیابێت. بەڵام ئەو سەرگوزەشتانەی نموونەیەکی خەیاڵاوین بەجۆرێکی تــایبەت، قســە لەســەر نــاوەڕۆکی ئــازاردان و ئەشــکەنجەکانی دۆزەخ

٦٤ : یەکێکە لە کەسایەتییەکانی ئینجیل، لە بەیت لەحم لەدایکبووە و دەچێتەوە سەر خانەوادەیەکی پادشایی(حەزرەتی داود). بەپێی بیروباوەڕی کریستیانی، خودا حەزرەتی جوبرائیلی نارد بۆ شاری ناسرە تا مژدەی منداڵێک بە مریەم بدات، کە ئەوکات دەزگیرانی یوسفی دارتاش بوو، یوسف بیری لەوە کردەوە دەزگیرانییەکە هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام لەپاش لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا، یوسف خانەوادەکەی بردە میسر لەترسی پادشای جولەکە و سامرە(هیردۆس) کە دەیویست کۆرپە لەدایکبووەکە بکوژێت، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ سێ کەسی سەر بە ئایینی زەردەشتی کردبوو، کە هاتبوون و سوجدەیان بۆ کۆرپەکە بردبوو، دیارییان پێشکەش کردبوو. بەو جۆرە یوسف بەخێوکردنی حەزرەتی عیسای لەئەستۆ گرتبوو، بۆیە لای کڵێسا بە کەسێکی پیرۆز دادەنرێ.

دەکەن. یەکەمین گێڕانەوەیەکی ورد لە(خەونەکانی پترۆس)دا بینراوە، کە لەنێوان سالانی ١٢٥ و ١٥٠دا زیاتر پێدەچێت لە ئەسکەندەرییە نووسرابێتەوە. نمایشکردنی ئەشکەنجەدانەکان، نموونەیەکی بەراییە کە هونەرمەندەکان هەتا کۆتایی سەدەی ناوەند، چەندبارەیان کردۆتەوە. " هەروا شوێنیترم بەو ئاراستەیە بینی، لەوپەڕی کلۆلی، جێیەک بوو بۆ سزادان، ئازاردەر و فریشتەکان ئەشکەنجەیان دەدان، جلکی رەشیان پۆشیبوو، رەنگی کەشی ئەوێیان گرتبوو".

"هەندێ لەوێ بە زمان هەڵواسرابوون: ئەوە ئەوانە بوون کە لە پەیڕەوی دادوەری لایاندابوو، لەژێریانەوە ئاگر کڵپەی دەسەند و شوێنی حەوانەوەیان دەشێوا". " دەریاچەیەکی گەورەی پڕ لە لیتەی گەرم، خەڵکێکی تێدا نغرۆ دەکرا، کە لە راستەڕێی دادوەریی لایان دابوو، فریشتەکانیش بەسەریانەوە دەوەستان و ئەشکەنجەیان بەڕوودا دەکردنەوە". " بێجگە لەوان ژن لەسەر ئەم لیتە رەشە سوتێنەرە بەقژ هەڵواسرابوون، ئەمە ئەوانە بوون کە خۆیان لەپێناو زیناکاریدا رازاندبۆوە". " ئەو پیاوانەش لەکاری زینا بەشدارببوون بە قاچ هەڵواسرابوون، سەریان لەنێو لیتەدا نغرۆ بووە و دەڵێن- بڕوامان وا نەبوو کە دێینە ئەم شوێنە-". بکوژ و شەریکەکانیانم دەبینی، فڕێدرابوونە شوێنی تەسکەوە، پڕ لە ماری دڕندە، مارەکان پێوەیان دەدان و لەناو ئازاردا دەتلانەوە، کرمەکان بەسەر سەریاندا دێن و دەچن هەروەک هەورە رەشەکان، قوربانییەکانی دەستی ئەوانە لەوێوە دەڕوانن سزادانەکانیان و دەڵێن" چەند دەسەلاتت دادوەرانەیە ئەی خودا". " زۆر نزیک لەوێ شوێنیترم بینی، تەسک و کێم و بۆگەنی پێدا دەڕۆیشت، هی ئەوانە بوون کە ئەشکەنجە دەدران، ئەوجا کۆدەبۆوە و نیمچە دەریایەکی درووستدەکرد. لەوێ ژن تا بینەقاقای لەنێو کێمدا نوقم بووە،

لەبەردەمیاندا ژمارەیەکی زۆر منداڵ هەیە، کە پێش وادەی لەدایکبوونیان، لەدایک بوون و دەگرین، تێیاندا هەبوو فوارەی گڕاوی لێوەدەردەچوو بۆ چاوی ژنەکان، ئەم ژنانە ئەوانەبوون کە ناشەرعییانە دوو گیان ببوون و منداڵەکانیان کوشتبوو". ئەم دیمەنە لەنێوان ساڵانی ٢٤٠ و ٢٥٠ دا لە دەقێکی دیکەی میسریدا بە ناوی(خەونەکانی پۆڵس) دووبارە بۆتەوە و پێشخراوە و دانتی پشتی پێدەبەستێت. پۆڵس بە یاوەری فریشتە دەگاتە رووباری ئاگر و ئەم ئەشکەنجەدانانە دەبینێت. فریشتەکە لەوێ دڵنیای دەکاتەوە کە بە گشتی(١٤٤٠٠٠) دۆخی جۆراوجۆر هەیە. زۆرێ لەو دۆخانە لە میتۆلۆژیای رۆژهەڵاتی وەرگیراون، لەوانە مەسەلەی پردەکەی هێناوەتە ناوەوە کە گوناهباری لێدەکەوێتە خوارەوە.

پیس و پۆخڵەکان هەتا ناوکیان لە ئاوی رەشدا نوقمبووە، ئەمە ئەوانەن کە چێژیان لەناخۆشییەکانی خەڵک دەبینی، ئەوانەشی کە خراپەکارییان بەرانبەر بە هەتیو کردووە، بە بەستەڵەکێک لە ئاگر دەسووتێن. گڕ سووخۆرەکان لووش دەدا، هەزار گیان بە خلۆکەیەکی ئاگردا هەڵواسراون و بەرۆژدا هەزار جار سوورِ دەخوات، ئیدی ئاوا بەردەوام دووبارە دەبێتەوە. لە هەفتەیەکیشدا بۆ یەک جار ئەم ئەشکەنجەدانانە رادەگیرێت. لە خەون و خەیاڵەکانی حەسدراس بۆ یەکەمینجار ناوی یەکێ لە تیاچووەکان دەهێنرێت، کە ئەویش "هیرۆدس"ە.

لە سەدەی دووەمەوە، دۆزەخ وەک گۆچانێ لەلایەن بەرگریکاران لە ئایینی کریستیانی بەکارهاتووە، ئەوانە لە بەکارهێنانی چەکی ترسێنەردا کارامە بوون. یەکەمین بەڵگەش لەو سەدەیە لای سەینت(قەدیس) یوستنیانس[٦٥] دەبینین.

---

٦٥ : سیفەتێکە دەدرێتە پاڵ ئەو کەسانەی لە ژیانیاندا بەرپرسیارێتییەک دەگرنە ئەستۆ کە جیهادی رۆحییە بەمەبەستی گەیشتن بە باڵای مەسیح، بۆیە پیرۆز دەکرێن بۆ ئامانجێکی

" رەنگە فەلسەفاندنانە بڵێن، ئەوەی ئێمە دەیڵێین لەبارەی سزادانی گوناهباران لە ئاگری هەتاهەتایی، تەنیا هەر قسەیە یان شێوازێکە لە تۆقاندن، ئێمە دەمانەوێ بە ترساندن خەڵک بێنینە سەر رێی چاکە نەک بە خۆشەویستیی. بە چەند وشەیەکی کەم وەڵامی ئەمە دەدەمەوە، گەر ئەمە بوونی نەبێت ئەوا خوداش بوونی نییە، یان گەر هەبێت و گوێ نەداتە بوونی مرۆڤ، ئەوا چاکە و خراپەش شتێ نین، یاسادانەران نارەوایانە سزای ئەوانە دەدەن، کە رێنماییە باشەکان پێشێل دەکەن".

".... زۆر زیاتر لەئێمەدا دەیبینن وەک ئەوەی لە کەسانیتردا دەیبینن، لەپێناو ئاشتیدا یاوەر و یاریدەدەرین، چونکە دەزانین کەس ناتوانێت لەبەردەم خودادا هەڵبێت: شەڕەنگێز، رژد، ناپاک تەنانەت مرۆڤی پاکیش. هەریەکە بەپێی کارەکانی سزا یان رزگاربوونی هەتا هەتایی مسۆگەر دەکا. گەر هەموو خەڵک ئەمەی بزانیبا، بۆ ساتێکیش تاوانیان ئەنجام نەدەدا، چونکە دەیانزانی ئەوە دەبێ ئەشکەنجەیەکی هەتاهەتایی لە ئاگردا بەدوادا بێت، ئیتر ئەو کات هەرچۆنێ بووە خۆی دەپاراست و چاکەکانی سەنگینتر دەکرد، تا ئەو بەخششانەی بەرکەوێ کە خودا بەڵێنی داوە و رووبەڕووی ئەشکەنجەکان نەبێتەوە".(بەرگریی نۆیەم).

مینۆسیۆس فیلیکس[٦٦] لە کتێبەکەی(ئۆکتاڤیۆس) هەوڵدەدا بیسەلمێنێ کە لەنێوان سالانی ٢٠٠ و ٢٤٥ بەردەوامییەک لەنێوان دۆزەخی بتپەرستی نێو ئەلیادە و دۆزەخی کریستیانیدا هەیە، وای وێنا دەکا کە یەکەمیان وەک ئەوە وایە لە تەورات وەرگیرابێت. قسەی خودانی کڵێسا

---

دیاریکراو لەلایەن کاهینێکەوە بەناوی سیانەی پیرۆزەوە. لەزمانی عەرەبیدا بە قەدیس(القدیس) ناودەبرێن.

٦٦ : نووسەرێکی لاتینی و مەسیحییە، هەوڵیداوە بە شێوازی شیشرۆنی مەسیحییەت بە رۆشنبیران بناسێنێت.

لەسەر ترس لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠-٢٠٠ لە (نامەیەک بۆ دیۆنیت)دا بۆی گەڕاونەتەوە، هەروەک چۆن بەتایبەتی لە ترتلیانۆس-یشدا باسی دەکات کە لە روانگەی ئەوەوە گیانی مردووان لە هادیس چاوەڕێی پاداشتن، بەڵام خراپەکاران دەسووتێنرێن و چاوەڕێی ئەشکەنجە ئامادەکراوەکەن کە لە کۆتاییهاتنی جیهاندا دەست پیدەکات. ترتلیانۆس پێشوەختە چێژ لەوە دەبینی، کە دەڵێ" من پێدەکەنم کاتێ ئەو هەموو فەیلەسوفە دەبینم لەگەڵ قوتابیەکانیاندا دەبرژێنرێن، ئەوانە وایان گۆشکردبوون کە خودا بایەخ بەم دنیایە نادات".

ئەم ترسە لە ئاگری هەتاهەتایی، یارمەتیی شەهیدانی داوە بەرگەی سوکایەتی پێکردنەکان بگرن، هەروەک( کارەکانی پەیامهێن سەینت پۆلیکاریۆس) کە لە ساڵی ١٥٦ کوژرا، شایەتی بۆ دەدا، ئەو رایدەگەیەنێ کە وا پێدەچوو کوورەی ئاگر بۆ ئەوان سارد بێت، چونکە لە ئاگرێکی گەلێ بەتینتری دوور دەخستنەوە.

دۆزەخی میللی بەشێوەیێ خۆبەخۆ پێشدەکەوێ و بەهۆی وەرگرتنی لە ئایینەکانی دیکەوە، بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییگەلێ کە سروش بەجێی-هێشتووە، بەزوویی دەوڵەمەند دەبێ و تۆڵەیەکیش لەهێزدار و دەوڵەمەند و خۆشبژییێکان، بۆ باوەڕداران فەراهەم دەکا، بەتایبەت لەوانەی چاوچنۆک و دەستداخراو و زیناکار و زۆرخۆر و تەمبەڵ و لووتبەرزن، کە لە دۆزەخدا دەیانبینین. بەڵام ئەوەی جێی مەترسییە، لەنێو ئەم خەیاڵە باڵدارانەدا بە لێشاو بیروباوەڕ هەن، لەبەرئەوە هزرڤانە گاورەکانی سەرەتا و باوانی کڵێسا، دەستیاندایە رێکخستنی بابەتەکە و بە ئەقڵانیکردنی و وێناکردنی دۆزەخێک کە لەگەڵ دراوەکانی(معطیات) پەڕاوەکەدا بگونجێت. توانایەکی زۆریان وەگەڕخست بیئەوەی بگەنە چارەسەرێ بۆ سەرجەم مەسەلەکان.

### ٢- بنەماکانی باوەڕ: باوانی کڵێسا:

زۆر لێکدانەوە لە هەگبەماندا هەیە، یەکێ لەوانە کە پێشڤەچوونی بەخۆوە دیوە بەتایبەت لە ئەسکەندەرییە، سەنتەری سیڤیلی مەزنە، ئەم سەنتەرە دۆزەخ وا دەبینێ کە مانایەکی رەمزی و راگوزەری هەیە. بۆ ئەم تیمەی یەکەمی هزرڤانان، بوونی شوێنێ بۆ ئازار و ئەشکەنجەی هەتاهەتایی، لەگەڵ بەزەیی و میهرەبانی خوداییدا یەکناگرنەوە. لەسەرەتای سەدەی سێیەمەوە(کلیمنسی ئەسکەندەری) ئاگری دۆزەخ وا پەسن دەکا کە خواستنێکە(ئیستیعارە) و لای تیاچووەکان مانای نائاسودەیی ویژدان دەگەیەنێ، ئەوە ئاگرێکی رۆحییە لەگیان بەردەبێ. قوتابیەکەشی بەناوی ئۆریگانۆس هەمان شوێن پێی ئەوی هەڵگرتەوە، کە وا دەبینێ ئازار و ئەشکەنجەی گوناهبار لەوێوە دەست پێدەکات، خۆی دەخاتە دەرەوەی هەماهەنگیی گەردوونەوە، کە خودا ئەفراندوویەتی، واتە ئەو مەسەلەیەی کە تووشی ئەم لێکهەڵوەشانەی دەکات. لە کۆتایی سەردەمەکاندا و لە رزگاربوونێکی سەرتاسەریدا، تەواوی درووستکراوەکان بۆ ئامێزی خودا دەگەڕێنەوە. ئەمە بڕوای ئەپۆکاتستازە(apocatastase) کە پێیوایە خودی شەیتان لەبەردەم ئەگەری ئەوەدایە رزگار بێت، هەروا مەزنترین گوناهباریش" تۆش ئەی خوێنەر، بۆت هەیە بڕیار بدەیت کە ئاخۆ ئەم بەشەی درووستکراوان لە تەنیایی و هەماهەنگیی کۆتاییدا لە سەردەمێکی کات دیاریکراودا دەمێننەوە یان، لە دەورانێکدا دەمێننەوە کە بۆ هەتا هەتایە بەردەوام دەبێ".

لەسەدەی چوارەمدا دیدیمۆسی نابینا و سەنیت ئەمبرۆسیۆس بەجیا ئەم هەڵوێستە میهرەبانییەیان وەرگرت. سەبارەت بە سەنیت ئەمبرۆسیۆس، تەنیا کافر و بێباوەڕەکان لە دۆزەخدا بە نەمری

دەمێنــنەوە. گاورەکــانیش لەرێــگەی بــاوەڕ و نهێنــی پــاکژبوونەوەوە ڕزگاریان دەبێ.

گریگۆریۆسی نەیسی بڕوای ئەپۆکاتستازی هەڵگرت، دۆزەخ بۆ ئەو تەنیا شوێنی پاکبوونەوەیە و کاتێ هەموو خراپەکاران لە خراپەکانیان پـاکژ دەبـنەوە، چ پێویسـت بە مـانەوەی ناکـات. لە یەکـێ لە وتـاردانە ئایینیەکانیـدا، رسـتەیەک هـاتووە کە مانـای رزگـاربوونی یەکجـارەکی شـەیتان-یـش لەخۆدەگرێـت: "خـودای بەرجەسـتە سـەرچاوەی هەمـوو قسـەیەکە کە گـوتراوە، رزگارکـاری مـرۆڤە لە نـابووتی و شەفابەخشـە، لەهەمان کاتدا دروستکاری نابووتیشە" .

سەینت جیرۆم لە سەرەتای سەدەی پێنجەم دوودڵ بوو، پشتیوانیی لە هەڵوێستە پێکناکۆکەکان دەکرد، کە نیازە شاراوە و پراکتیکەکانیان بێ خەوش نەبــوون، بەڵام لە روونکردنەوەکــانی لەســەر نــامەگەلێکی ئاراسـتەکراو بـۆ خەڵکـی ئەفسـس، جەخـت لەسـەر بـوونی دۆزەخێـک دەکاتەوە، کە هەستپێکراوە و ئاگر و پشکۆی راستەقینەی هەیە. پێدەچێ لە لێکدانەوەکانی بۆ(ئەشـعیا) لەسـاڵی ٤١٠-دا مەیلـی بەلای چەمکەکەی ئۆریگانۆسدا چووبێ، لەگەڵ خستنەڕووی ئەو قسـەیەش کە ئەم راستییە باش نییە لەنێو میللەتدا بڵاوبکرێتەوە، چونکە پێویستیان بە هەڕەشـەی دۆزەخێکی هەتـا هەتـایی هەیە تـا ژیـانێکی بـاش بژین: " دەڵـێن پێویسـتە لەبـارەی ئەم مەسـەلەیەوە بێدەنگ بـین تـا تـرس هەر باڵادەسـت بێ"، بۆ ئەوانەی کە تـرس بەلایـانەوە شـێوازێکە بـۆ هەڵاتـن لە گوناهکـاری. بەڵام ئێمە دەبێ ئەرکی ئەوە بۆ خـودا بەجێ بێڵـین، تـا سـنوورەکانی خـودا لە سـەپاندنی میهرەبـانی و سـزادا ببینـرێن، ئـارەزووی خـۆیەتی کـێ دیـاری دەکات بۆ سزادان و چ کەسێ و چۆن"( لە لێکدانەوەکانی ئەشعیا،XVIII).

قازانجی پراکتیکییانەی دۆزەخ وەک هەڕەشەیەک بە گەورەترین سزا، تا باوەڕداران ڕێی ڕاست بەرنەدەن، ماددی و هەتاهەتاییە، ڕەنگە ئەمە هۆکاری سەرەکیی تێشکانی ڕەوتی ئۆریگینۆس بێت. ترسان لە دۆزەخ هەتا سەدەی بیستیش، بەڵگەی کۆتاییە بەدەست دەسەڵاتی کڵێساوە. لەلایەکی دیکەوە ڕەنگە ئەمە هۆکاری سەرکەوتنی لایەنگرانی بۆچوونی توندی نێو ئیمپراتۆریای پاش کۆستەنتین بێ، کە لەژێر کاریگەریی یاسای سزاداندا بوون، ئەو یاسایە تا ڕادەیەکی زۆر توند بوو. لەم سەردەمە باوانی کڵێسا سەریان هەڵدا و پێکهاتن، کە ملکەچی چەمکە دادوەرییە دیوانییەکان(بیرۆکراتی) و شێوەییەکانی دەوروبەریان بوون. مێژووی ڕۆژی دوایی و ئازارەکانی ئەودنیا، بەرادەیەکی سەیر شان بە شانی مێژووی دادوەریی مرۆیی دەڕوات.

لە سەدەی سێیەم سەینت کبریانۆس کە لەنێو چەوساندنەوەکاندا بۆچوونەکانی خۆی نووسیوە(لەساڵی ٢٥٨ سەریان بڕی)بەهەندێ خۆشییەوە هەڵوەستە لەسەر بیرۆکەی دۆزەخ دەکا، وەک تۆڵەسەندنێکی مەزن لە بتپەرستە ستەمکارەکان، کە هەرچەندێ هەڵبژێردراوەکان دڵخۆش بن، ئەوان ئازاریان زیاتر دەبێ. " ڕۆژی دوایی چەندە مەزنە! ئەو کاتە خودا میللەتەکەی تاقیدەکاتەوە، بە زانینە وردە ئیلاهییەکەی هەریەکە بەمافی خۆی دەگا، تاوانبارەکان ڕەوانەی دۆزەخ دەکرێن و چەوسێنەرەکانیشمان بە گەرمای هەمیشەیی ئاگرێکی هەڵچوو، پاداشت دەکرێن، ئێمەش لەبەر بڕوا و خوداپەرستیمان پاداشت دەکرێین. کاتێ وەختی ئەم ئاشکرابوونە دێت، نەمریی خودا بەسەر سەرمانەوە پرشنگ دەداتەوە، بەختیار و دڵخۆش دەبین کە خودا بە بەزەیی خۆی گەورەمان دەکات، ئەوانەش دەستبەرداری خودا بوون یان لێی یاخی بوون، لە باری تۆمەتباری و کلۆڵیدا دەبن، ئەوانەی ویستی شەیتانیان جێبەجێ کردووە،

بێگومان لەگەڵ شەیتاندا دەبن و بە ئاگرێک دەسووتێن، کە خامۆشبوونی نییە"(نامەی ١٠،٥٨).

دۆزەخ لای هیپۆلیتی رۆمی و ئەناستاز و کیریلۆسی ئۆرشەلیمی و کیریلۆسی ئەسکەندەری لە رۆژی دواییەوە دەست پێدەکات، بەڵام دەکرێ تیاچووەکان لە چاوەڕوانیدا لەلایەک بهێڵرێنەوە و ئەو ئەشکەنجانەیان نیشان بدەن کە رووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەوانە(واتە بیرمەندەکان) لەسەر سروشتی ئاگری دۆزەخ وتووێژێکی زۆر دەکەن: ئاگرێکی ماددییە کار لە جەستە و گیان دەکا، پێویستی بە سوتەمەنی نییە، چەندێ جەستە هەڵلوشێت، ئەوەندەش دەتوانێ درووستی بکاتەوە. گریگۆریۆس وا دەبینێ کە دوو جۆر ئاگر هەیە، یەکێکیان پاکژکارە و ئەویتریان سزادەر. یۆحەننای دەمزێڕ لە سەدەی چوارەم پێشنیاری چەمکێکی توندتر دەکا و دەڵێ: دۆزەخ ماددی و هەتاهەتاییە، هەموو بتپەرستەکان بێ چەندوچوون چارەنووسیان ئاگرە، لەبەرئەوەی بە ئاو پاکژنەکراونەتەوە، بێجگە لە خراپە، کاری دیکەیان نەکردووە. بەڵام ئەوانە گەر کاری چاکەیان کردبێت، بە شێوەیەکی سرووشتی بووە، بەواتایەکیتر هیچ پاداشتێکی نییە یاخود چاکەیان کردووە تا بەهایەک بەخودی خۆیان بدەن، کە ئەمەش لە لوتبەرزییەوە سەرچاوەی گرتووە:" چونکە گەر بەڵێنی ئاسمان و هەڕەشەی دۆزەخ بەس نەبێ بۆ ئەوەی خەڵک بخەنەسەر رێی راست، ئەوا ئەوانەی بڕوایان بەهیچ شتێک نییە، چاکەکردنەکانیان هێندە زۆر نییە، گەر هەشبێت لە پێناوی ناوبانگیدا دەیکەن، دۆخەکەش هەروایە ئەوەی هەموو کاتێ چاکە دەکات لە پێناوی ناو و شۆرەتدا، دواجار خۆی لێ-دەگۆڕێت و کوێرانە دەکەوێتە شوێن ئارەزووە خراپەکانی" (ئامۆژگاری یەکەم لە سەینت یۆحەننا، XXVIII،٢).

بەڵام کرۆکی سزای تاهەتایی لەسەر هەڵە راگوزەرەکان لەبابەتێکی زۆر ئاسایی، چیدیکە نییە: ئایا دادوەریی مرۆڤ لەسەر هەڵەیەکی ساتەوەختی، سزایەکی هەمیشەیی دەرناکات؟ لەکاتێکدا هەمیشەیی لەدنیاکەیتر هەتا هەتاییە.

ساینت ئەگستینۆس لەسەرەتای سەدەی پێنجەمدا، شێوەیەکی نیمچە کۆتایی بەخشییە هێڵە گەورەکانی دۆزەخی کریستیانی. ئەو شەبەنگەش کە ببووە فۆرمێکی هەمیشەیی دۆزەخ لە مێژووی کڵێسا، بایەخێکی تایبەتی بە هزرەکانی ئەگستینۆس دا. لە راستیدا لێکۆڵینەوەکانی ئەگستینۆس کاری دیالیکتیکین، تا رادەیەکی زۆر رووخسارێکی کۆنکرێتی بەخشیوەتە دۆزەخ، چەمکێکی تووڕە دێنێتە ئاراوە، وەک کاردانەوەیەک لەبەرانبەر هێرشگەلی بتپەرستان و رەوتگەلی لێبووردەیی.

بەو پێیە هەموو بتپەرستان و قوربانیانی گوناهی بنچینەیی، تەواوی ئەو منداڵانەی مردن و لە نهێنی پاکژبوونەوە بێ بەهرە بوون، هەموو ئەو گاورانەی بیر لە گوناهکاری دەکەنەوە، دەکەونە بەر ئەشکەنجەی هەتا هەتایی دۆزەخ. بەدرووستی دۆزەخ لە رۆژی حەشرەوە دەست پێدەکات، لەئێستاشەوە هەتا ئەو کاتە، تیاچووەکان ئازار دەچێژن، هەروەک لە نموونەکەی ئەلیعازر و دەوڵەمەندە شەڕەنگێزەکەدا دەردەکەوێت. لەگەڵ یەکەم ساتی کۆتاهاتنی جیهان، ئازارەکانیان زیاد دەکا، توخمی سەرەکیی ئەشکەنجەدانیش ئاگر دەبێت، کە ئاگرێ ماددییە و جەستە و گیان دەسووتێنێ بێئەوەی لەناویان بەرێ. ساینت ئەگستینۆس وا دەبینێ ئاگری پاکژکار هەیە و کاتییە، ئەمجۆرە ئاگرە بۆ ئەوانەیە کە زۆر خراپ نین، ئاگری هەتاهەتایش، تینی کەمترە و بۆ ئەوانەیە کە زۆر باش نین.

لەکۆتایی سەردەمی باوانی کڵێسا، دوو چەمکی تەواوکار لەبارەی دۆزەخەوە درووست بوون، چەمکێکی میللی لەخەیاڵ و نووسینە

هەڵبەستراوەکانەوە لق و پۆپی لێبېۆوە، لە چاخی ناوەڕاستدا خەیاڵدانی ڕەبەنیانە پێشیخست و دەوڵەمەندی کردبوو، ئەوی دیکەشیان چەمکێکی فیکری بوو، کە زۆرێ پرسیاری لەئامێز دەگرت و ئاييینپەروەرە کلاسیکییەکان شییانکردەوە و خۆشخوانییان پێدا.

**٣- دۆزەخی خەیاڵدانی ڕەبەنیی:**

دۆزەخی کریستیانی بەچەمکە تەقلیدییەکەی، زۆر قەرزاری ئەو ناوەندە ڕەبەنییانەیە، بەشێوازێکی گەلێ سنووردار لەسەر ڕزگاربوون دەدوێن، کە تێیدا ئاسمانی بۆ دەستەبژێرێکی چاکەخواز داناوە و تیاچوونیش بۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵک. هەر لە سەرەتاکانی یەکەمەوە ژیانی ڕەبەنیی گەشە دەکات، ئەو شێوازە ژیانە پشتبەستووە لەسەر زاهیدێتی و خۆبرسیکردن، بە بەردەوام هێزەکانی خراپە هاموشۆی دەکەن، قاڵبوونەوەش لە دۆزەخدا پەرەدەسێنێت. زۆرجار ڕەبەنەکان کە لە کۆمەڵە عەقڵێکی سەرەتایی پێکدێن، لە ناوجەرگەی بیروباوەڕە مىللییەکانەوە سەرهەڵدەدەن و لەنێو ژینگەیەکی داخراودا دەژین، بەزۆری ڕادەستی چیرۆک و گێڕانەوە سەیر و سەمەرە و خەیاڵییەکان دەبن، کە کەسی تاقیکراوە و شەیتان ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینن.

لەسەدەی شەشەمەوە سیزیر دارلا-ی کەشیش لە مۆنەستێری(الدير)[٦٧] لێرینس، کە دواتر بووە بیشوبی(اسقف)[٦٨] ئارل،

---

٦٧ : لەنێو کریستیانەکاندا کڵێسا بەگشتی شوێنی پەرستنە، بەڵام ئەم وشەیە پۆلێنبەندیی بۆ کراوە لەنێوان کڵێسا و کاتدرائیە و ئەبرەشیە و مۆنەستێر، کە هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆی هەیە، کڵێسا لە بنەچەدا وشەیەکی یۆنانییە(ئەکلیسیا) کە مانای (بانگەوازکردن یان گردبوونەوە) دەدات یان کۆبوونەوەی کۆمەڵێک مرۆڤ. مۆنەستێر شوێنی پەرستن و تێرامانە و ڕەبەنی تێدا دەژی کە خۆیان لە چێژەکانی ژیان بێبەش دەکەن و ژیانی ئاسایی دەژین، لە بنەچەدا وشەکە ئارامییە و واتای مەزرا یان ماڵی جوتیار دەگەیەنێت، بەهۆی شێوازی گوزەران و ژیانی ڕەبەنە سەرەتاییەکانی جولەکە و کریستیانەکان. کاتدرائیە

لەسەر ئاستێکی فراوان لە وتارەکانیدا، بەدۆزەخ خەڵکی دەترساند، وای-
کرد هەندێ کەس بە زێدپێوەنان تۆمەتباری بکەن. لە یەکێک لە وتارەکانیدا
بیرکردنەوەکانی روون‌دەکاتەوە و دەڵێ:

بــرا و ئــازیزانم داواتــان لــێ‌دەکەم، بەلەخــۆبردووییەکی مەزنەوە
ئامۆژگاریتـان دەدەمـێ، کەسـتان لەمـن تـووڕە نەبـێ، ئەو دۆخەی بـۆی
دەکۆشم بۆ ئەوەیە واتان لێ‌بکەم، تا بۆ چەندین جار گوێی لێ‌بگرن، وای
دامەنێن کە لەوانەیە لەجێی خۆی نەبێت یان هەر بۆ گوتنە، ئەو دۆخەش
رۆژی کۆتـاییە، کە دەبێـت مەسـەلەی تـرس و بـابەتی سـەختی
رزگاربوونمـان بێت(...) رەنگە بە خەیاڵی یەکێکتانـدا بێت و بڵێت: بـۆچی
هەمیشە ئامۆژگاریمان لەبارەی شتگەلێ دەدەنێ، کە بەو رادەیە سەخت و
دژوارن؟ ئەمە لەبەرئەوەیە کە بۆ مرۆڤ باشترە لەم ژیانەدا، شتێ لەتاڵی
بنۆشـێ بـۆ ئەوەی بگـاتە بەختیـاری هەمیشـەیی، لەبـری ئەوەی لێـرە
شادییەکی ساختەی دەستبکەوێ و لەوێش بکەوێتە ژێر ئەشکەنجەیەک
کە کۆتایی نایەت.

---

بارەگای مەترانە، ئەم وشەیە لە کڵێسای ئەرتۆزۆکسی رۆژهەڵاتی بەکار نایەت. ئەبرەشیە بچووکترین یەکەیە لە سیستەمی کڵێسا کە قەشەیەک سەرۆکاری دەکات.

٦٨ : چەند زاراوە و ناوێک هەن کە لەنێو قەشەکانی کریستیانیدا بەکاردێن، ئەسقوف پلەیەکی گەورەیە و بەرپرسە لە ژمارەیەک کڵێسا لەنێو هەرێمێکی دیاریکراودا، قەشە سەرۆکاری کڵێسا دەکات، وا باوە ئەسقوف لە کڵێسای گەورەی هەرێمەکەدا دادەنیشێت و دەیکاتە بارەگای خۆی، کە بەم بارەگایە دەگوترێت کاتدرائی. ئەو ناوچانەی دەکەونە سنووری چالاکی ئەسقوفەوە پێیان دەگوترێت ئەبرەشیە. لەدوای قەشە لەرووی پلەوە شەماس دێت کە پلەی خوارترە لە قەشە. مەتران ئەسقوفێکی گەورەیە، دەبێتە بەرپرس لەسەر ئەبرەشیە و مەترانیە، ئەم وشەیە بەناوی خاوەنی شاری گەورە دێت. بەڵام سەرۆکی هەموو ئەسقوف و مەترانەکان پێی دەگوترێت پەتریارک.

کەواتە لە مۆنەستێرییەکاندا نەریتی چیرۆکەکانی سەفەر بەرەو دۆزەخ، بەردەوام بــــووە، ئەوەش لەشـــــێوەی خەیـــــاڵی ئـــــاوێتە بە رووداوە مێژووییەکانەوە دارێـژراون تـا زیـاتر لە راستییەوە نزیک بـن. لەسەدەی هەشتەم کتێبی" مێژووی کڵێسای ئینگلتەرا" لە دانانی(بید)ی پیاوخاس کە کەشیشێکی ئەنگلۆسەکسۆنی بوو لە مۆنەستێری جارۆ، چوار دیمەنی خەیالّی دۆزەخییانە لەخۆدەگریَ: خەیاڵی رەبەنێکی ئێرلەندی بەناوی فۆرسی، کە گیانی لە جەستەی جودا دەبێتەوە و فریشتە بۆ سەردانی دۆزەخی دەبا و لەویَ دریکتەلم دەبینیَ، کە پیاوێکە لە نۆرتەمبەرلاند، ئێوارەیەک گیانی لەدەستدا و بۆ رۆژی دواتر هەستایەوە. فەرماندەی سوپا پادشا میرسیا دەبینیَ، رەبەنێک دەبینیَ رێز لە ژیانی رەبەنایەتی ناگرێت. هەر چیرۆکێک بێگومان پەیامێکی مۆراڵی هەیە. دریکتەلم دەگاتە لێواری چاڵیَ، گڕی ئاگرێکی گەورە و پریشکگەلێکی لێوە دەردەچیَ، کە بریتین لە گیانی مردووەکان و بە حەوادا فڕێدەدرێن. " بە تۆقیوی بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێدا وەستام، نازانم چی بکەم و چیم بەسەر دێت، لەناکاو لەدوامەوە گوێم لەدەنگی نرکە و ناڵەیەکی زۆر بەسویَ بوو، لەگەڵیشیدا قاقایەکی ترسناک، هەروەک ئەوەی حەشاماتێک بێت و بەدوژمنە پێوەندکراوەکانیان پیَبکەنن. هاوارەکە بڵند و نزیک دەبۆوە، کۆمەڵیَ خراپەکارم بینی، پێنج گیانی مرۆڤیان رادەکێشا و دەیانقیڕاند، دەیاننالآند و بەرەو هەڵدێرە تاریکەکانیان دەبردن، لەکاتێکدا شەیتانەکان قاقا پیَدەکەنین و قریوەیان لیَدەدا. لەنێویاندا پیاوێکی سەر تاشراوم بینی هەروەک عادەتی پیاوانی ئاینی، لەگەڵ عیلمانییەک و ژنێکدا، رۆحە شەڕەنگێزەکان بەرەو چاڵێکی گڕگرتوویان بردن، کاتیَ لەویَ نغرۆ دەکران، ئیدی نەمتوانی گریانی پیاوەکان و قاقای ئیبلیسەکان لێکجودا

بکەمەوە، بەڵام تەنیا ژاوە ژاوێکم دەبیست".( مێژووی کڵێسا و میللەتی ئینگلیزی v، 12).

با خەیاڵەکانی دیکەی هەمان سەردەم لەبیرنەکەین، خەیاڵی رەبەنێک لە وێنلۆچ، کە رەبەنێکی‌تر دەیگێڕێتەوە، ئەویش ساینت بۆنیفاسە. خەیاڵی رەبەن سینیۆڵف، کە گریگۆریۆسی تۆری دەیگوازێتەوە. لەهەموو جارێکدا باسی پردێک دەکرێ کە بەسەر ئاگرەکەدا درێژبۆتەوە، ئەوی زۆر خۆشە خەیاڵی رەبەنە ئێرلەندییەکانە، کە بابەتەکانیان پەیوەستە بە کاسۆلیکبوونێکەوە، دەمێکە لە رۆما جیابۆتەوە.

یەکێ لە ناودارترین گێڕانەوەکان" سەفەری ساینت براندان"ـە، کە بێگومان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆیەم، دەگێڕێتەوە چۆن ئەم رەبەنە دوای دەریا بڕینێکی زۆر، دەگاتە کەناری دوورگەیەکی نەگبەت، کە لە بەردی کلسی پێکهاتووە، دەنگی فووکەری ئاسنگەر و چەکوشەکانی لێدێ. لەسەر یەکێ لە دوورگە بچووکەکان یەهودای ئەسخەریوتی پشووی هەفتانەی بەسەر دەبا، کە لە ئێوارەی شەممەوە دەست پێدەکات بۆ دوای نوێژی عەسری یەکشەممە کۆتایی دێ، ئەو بە وردی و لەسەرخۆ ئازارەکانی دەگێڕێتەوە:

" لەوێ لەگەڵ هیرۆدس و بیلاتیس و حنە[٦٩] و کیافا ئازارم چەشت. رۆژی دووشەممە لەسەر خلۆکەیەک لە مێخ درام و وەک رەشەبا گێژم دەخوارد. رۆژی سێشەممە لەسەر تەختەیەکی بزماراوی درێژکرام و بەردەکان خرانە سەر جەستەم: تەماشای جەستەی کون کونم کەن. رۆژی چوارشەممە لە زفتدا کوڵێنرام، ئاوهام لێ‌هات کە دەبینن. دواتر لاشەم کرا بە سیخدا و هەروەک پلە گۆشت برژێنرا. رۆژی پێنجشەممە لە

---

٦٩ : هاوسەری عەمران و دایکی حەزرەتی مریەم.

چاڵێکدا نوقمکرام و جەستەم بەستی، چ ئەشکەنجەیەک نییە لە تەزاندن ناخۆشتر. رۆژی هەینی پێستیان گوروم، خوێی پێداکرا، ئیبلیسەکان مس و قورقوشمی تواوەیان کرد بە گەروومدا. رۆژی شەممە فرێدرامە زیندانێکی رزیوەوە کە گەنیوییەکەی هێندە بەتین بوو، خەریک بوو دڵم دەهاتە دەرێ. ئەمە بێجگە لەو مسەی دەرخواردم درا. رۆژی یەکشەممەش لێرە دەمبینی، بە ساردا و خۆم دەشۆم". بیرۆکەی پشووی هەفتانە لە ئیتالیاش هەیە، هەروەک لە سەدەی یازدەدا لە بۆزۆلیس دەیبینین، هەموو شەمموانێک چۆلەکە رەشەکان دەفڕن، ئەوانە گیانی تیاچووەکانە دەچن بحەوێنەوە.

لەسەرەتای سەدەی حەوتەم، لای گریگۆریۆسی گەورە، کە رەبەن بوو بووە پاپا، چەند دیمەنێ دەبینین دووبارە پردەکە دێنێتەوە سەر شانۆ، بەڵام بەسەر رووبارێکی رەشی بۆگەندا راکێشراوە، ئیبلیسەکان لەسەری مۆڵیان خواردووە. تێیدا چیرۆکی پیاوێک دەخوێنینەوە بەناوی ئەستەفان، کە بەهەڵە نێردراوەتە دۆزەخ، شەیتان دەیگێڕێتەوە بۆ زەوی پاش ئەوەی تێدەگا کە بەدحاڵیبوونێ لە مەسەلەکەدا هەیە.

لەسەدەی دوازدە دنیابینی و خەیاڵی رەبەنەکان زیادیکرد، گرنگترینی ئەوانە لە دەوروبەری ساڵی ١١٣٠ بوو، خەیاڵی بەندێکتی ئەلبریک دی ستەفراتی، دوای ئەوەی لەهۆش خۆی چوو، کۆترێک دەیڕفێنێ و ساینت پەترۆس و دوو فریشتە بەرەو دۆزەخی دەبەن، لەوێ بەپێی هەڵە و گوناهەکان ئازار و ئەشکەنجەیەکی یەکجار زۆر دەبینێ: ئەو ئافرەتانەی کۆرپەکانیان بەخێو نەکردووە بە مەمک هەڵدەواسرێن و شیر بە مارەکان دەدەن. لەکاتی بوورانەوە پیاوەخاسەیەکی ئێرلەندی بەناوی تونگدال بەهەمانشێوە سەردانی دۆزەخ دەکا و فریشتە پاسەوانەکەی یاوەری دەبێ. ئەم دیمەنە فۆتۆگرافییە نایابە، کە لە دەوروبەری ساڵی ١١٥٠دا

ڕەبەنێکی ئێرلەندی نووسیبووی، بووە سەرچاوەیەکی بەپێز و ئیلهام-بەخش بۆ هونەرمەندان، بەتایبەت بۆ برایانی لیمبۆرگ، کە بەوردی وێنە سەرەکییەکەیان لە(ساتە هونەرییەکانی دۆق بێری)دا کێشاوە و بەزیندوویی هێشتوویانەتەوە: لە قوولایی دۆزەخ، شەیتانی زەبەلاح و توکن بەستراوەتەوە بە ئامێرەکانی ئەشکەنجەدان و ژیلەمۆوە، لەتاو ئازار پێچ دەخوات. جارێ بەبێ وادە هەزار لەکۆمەڵە تیاچووەکان بەدەستەکانی دەهاڕێ و جارێکیش کۆمەڵگەلێتر بەجۆشێکی تاعونیانەی سوتێنەرەوە، بەرەو بەرزاییە زۆر بڵندەکان فڕێیان دەدا. خەونەکانی تونگدال خەیاڵیش تێدەپەڕێنێ: دۆڵێکی دۆزەخی بەژیلەمۆ ڕێژکراو، لەسەرروویەوە بنمیچێکی سووتێنەر ئەوی دەکەوێتە خوارەوە، ئەوانەن کە باوک و دایک و برای خۆیانیان کوشتووە، دەتوێنەوە و زەنگۆڵ زەنگۆڵ هەروەک چەوری دەکەونە قەراغەکانەوە، دواتر دەبنەوە بە هەڵم و سەرلەنوێ شێوەی تەواو وەردەگرنەوە و دووبارە دەکەونەوە خوارەوە. بێڕەوشتەکانیش لە دەریاچەیەکی بەستوودا دەعەجانێک بەدەنووکەکانی قوتیان دەدا و هەرسیان دەکا، پاشان وەک پاشەڕۆ توڕیان دەداتە دەرەوە، مارەکان لەهەناویان دەترووکێن و پێستیان دەدڕن و دێنە دەرێ، لە شوێنێتر تیاچووەکان لەسەر ئاگرێکی سپی گەرم دەکرێنەوە و دەیانهاڕن، پاشان بە چەکوش پێکەوەیان دەلکێننەوە.

لەنێوان سالانی ۱۱۹۰ و ۱۲۱۰ یەکێ لە ڕەبەنەکانی ئینگلیز بەناوی ە. دی سالتری، وەسفی" پاکژکاری ساینت پاتریک"ی کردووە، کونێک ببووە دەروازەی و لەو سەردەمەوە نەریتە میللییەکان وایان داناوە کە دەبێ لە دورگەیەکدا بێت لەنزیک دەریاچەی دێرگ. ئەوە ئەو شوێنە بوو کە هەتا ئەمرۆش زیارەتکاران بۆی دەچن، سەرباری تێبینی و خۆپارێزی کڵێسا لەسەر ئەو بابەتە. خەیاڵی دۆزەخییانە هێندە بەربلاو و زۆر بوو، لە سالی

١٠٦٠دا ئۆتلـۆی رەبەن کتێبێکـی لەسـەر کـۆکردەوە نـاوی نـا" کتێبـی بینینەکان". لەساڵی ١٢٠٦ رۆجیەی رەبەن لە وندۆڤەر لە مۆنستێری سان ئەلبانس، خەونی لادێیەکی خەڵکی لەندەن دەگێڕێتەوە بەناوی تۆرچلا. زۆرینەی ئەم چیرۆکانەی بۆ سەرکۆنەکردنی کێماسییە تایبەتییەکان هۆنیبۆوە. هەندێتری رۆڵی سیاسی دەبینن، خەڵکێ بۆ دۆزەخ دەنێرێ کە دژی بۆچوونەکانی دانەر دەوەستنەوە. بۆ نموونە لەخەیاڵی سەدەی نۆیەمدا، بڕیاری لەسەر شارلا مارتڵ داوە کە تیاچووە، لەبەرئەوە سامانی کڵێسای زەوتکردووە.

## ٤- دۆزەخی لاهوتییەکان(تیۆلۆژستەکان):

دۆزەخی لاهوتییەکان سەنگینتر و ئارامترە، بونیادێکی عەقڵانییە و لەسەر پەڕاوی پیرۆز خۆی راگرتووە، بەڵام دەکەوێتە بەر کارلێکەکانی یاسا و فەلسەفە. لەهەردوو سەدەی دوازدە و سیانزە چەمکەکانی دۆزەخی لاهوتی جێ پێی خۆیان قایمکرد، جەدەلیەتیش پەرۆشی جیاکاری و بەرچاوڕوونی بۆ زیاد دەکات. مافی یاسایی لەگەڵ گراتیان و پیار لۆمبارد تاوتوێی دۆخەکانی تاکەکەسیی ساناتر دەکەن. مافی مەدەنی کە یاسادانەران لەسەر مۆدێلی مافی رۆمانی پێشی‌دەخەن، زیاتر ورد و روونتر دەبێ. بەڕاستی تیۆلۆژستەکان کە چەمکی دۆزەخ دێننە بوون، زۆرجار بەخۆیان پلەگەلێکیان لە مافی مەدەنی و مافی یاسایی دەست- دەکەوێ. لە دەوروبەری ساڵی ١١٤٠گراتیان لەراگەیاندنەکەیدا خەڵک بەسەر چوار دەستەدا دابەش دەکات: پیاوچاکان، خراپەکاران، خەڵکێ بەتەواوی پیاوچاک نین، خەڵکێ بەتەواوی خراپەکار نین. پیار لۆمپارد لە دەوروبەری ساڵی ١١٥٥ لە کتێبەکەیدا" چوار کتێب لەسەر پەند" پلەکانی خراپەکاریی جیادەکاتەوە و پێشنیاری سزای دۆزەخیی جۆراوجۆر دەخاتەروو.

خودا لەسەر شێوەی پادشا، پێش هەموو شتێک دادوەرە، لەسەرەتای سەدەی دوازدەوە، ئەم پیشەیە پێگەی یەکەم دەگرێ، هەروەک لە نەخش و نیگاری سەر دەرگای کاتدرایە و کڵێساکاندا دیارە: مەسیحی دادوەر لە کاتدرایەی شاری کۆنک لە نێوان ساڵی ١١٣٠ و ساڵی ١١٥٠، دواتر لە ئۆتۆن و لە سان دنیس. دیمەنەکە لە سەدەی سیانزە فراوانترە، تا ڕۆژی دوایی دەبێتە دادگە بەپێی ڕێنوێنییە ترسناکەکان: پەیامبەر و فریشتەکان ئامادە دەبن، ساینت میکائیل کارەکان لە تەرازوو دەدا، یۆحەننا و مریەم نێوەندگیری و داوای بەزەیی دەکەن. جولیانی ڤازلیانی لە ڤازلەی لە وتارەکانیدا، ڕووخسارێکی یاسایی لەگەڵ شاهێد و بەرگریکار و بڕیارەکان دەداتە ڕۆژی دوایی، سزاکانیش سیمایەکی بێبەزەییانەیان هەیە، هەروەک ئەو بڕیارانەی کە لە دادگەکانی فیوداڵی دەردەچن. چەشنی ئەو دادگایانە خودا حاکم و سکاڵاکارە، چونکە گوناهەکان ئەو سووکایەتی پێکردنانە بوون، کە دژ بەو دەکران.

لەسەدەی سیانزەدا سزاکان بوونە تاکەکەسی و جیاکاری لەنێوان گوناهە سەرپێییەکان و گوناهە کوشندەکان خەستتر کرایەوە. تەنیا گوناهە کوشندەکان دەبنە هۆی تیاچوونی هەتاهەتایی. لە ئاکامی ئەوەدا ڕۆڵی کڵێسا لە شەفاعەتکردندا پشتیوانی بۆ پەیدابوو، چونکە دانپێدانانی ساڵانە کە لە ساڵی ١٢١٥وە بووە زۆرەملێ(ئیجباری) لەگەڵ تۆبە و پەشیمانی دەربڕین لە خەتاکان، کڵێسای والێکرد کلیلی دۆزەخ و بەهەشتی بەدەست بێت.

هەرچەندە خشتەیەکی تایبەت بە گوناهە کوشندەکان، بوونی نییە، بەڵام هەندێکیان وا ناسراون کە ترسناکن بەهۆی پێشڤەچوونی ڕۆشنبیرییەوە. لە سەدەکانی یەکەم، لە سەردەمی چەوساندنەوە، یاخیبوون یان هەڵگەڕانەوە گوناهێ بوو شایانی سەرکۆنەکردن بوو. لە

سـەردەمەکانی میرۆڤنجـی کـاتێ کڵێسـا هەوڵـی دامەزرانـدنی سیسـتەمێکی کـۆمەڵایەتی دەدا، سـزای بەگژداچـوونەوەی ئەم سیسـتەمە، تیـاچوونی هەتاهەتایی بوو: سیزەری ئارلی وای دانا کە گوناهە ترسناکەکان کوشتن و دزی و مەسـتی و تـوورەیی و شـایەتیدانی درۆ و پێشـێلکردنی پیرۆزییەکانە. لەگەڵ هەڵکشانی رۆڵـی سـوارچاکی لە سیستەمی فیوداڵی و پێشکەوتنی بازرگـانی، لـوتبەرزیی و چڵێسـی هـاتنە پلەی یەکەم، بەهـۆی کـاریگەری مۆنسـتێرەکان، خەیـاڵی دۆزەخیـی پڕبـوون لە لـوتبەرزی و چاوچنۆکی و چەپەڵی، واتە دژی سێ نەزرە رەبەنییەکە کە لەخۆبردوویی و هەژاری و پاکییە.

لەو پرسیارە کلاسیکییانەی تیۆلۆژستەکان تاوتوێی دەکەن، پرسـیارێکی دڵەڕاوکـێ بەخـش هەیە، کە پەیوەسـتە بە ژمـارەی تیاچووەکـانەوە. تـا رادەیەک ئاراسـتەیەکی رەشـبینانەی هەیە، تۆمـا ئەکـوینی دەڵـێ" رزگاربووەکان کەمن". هاوچەرخەکەشـی ساینت بۆنـاڤنتۆرا(١٢١٧-١٢٧٤) بە پشـت بەسـتن بە شـێوازێکی وەرگیـراو لە یاسـای مەدەنـی، بڕوای وایە ژمـارەی تیاچووەکـان لە رزگاربووەکـان زیـاترە، تـا روون ببێـتەوە کە رزگاربوون بەخششێکی تایبەتییە، لەکاتێکدا تیاچوون زادەی دادوەرییەکی ئاساییە".

شـوێنی دۆزەخـیش کێشــە دەورووژێنــێ، گەر لە ســەرەتای ســەدەی دوازدەوە، هۆنۆریـۆس دوتـۆن وایزانیبــێ کە بێگومـان دۆزەخ دۆخێکـی فیکرییە و ناکرێت شـوێنێکی مـاددی هەبێ، ئەمجۆرە بۆچوونەی لە جـان سکۆت ئەریجین-ی هاووڵاتییە ئێرلەندییە نـاودارەکەی سـەدەی نۆیەمەوە وەرگرت، ئەوانەشـی کە ئەم بۆچوونەیـان هەبـوو، هەر بە کەمینە مـانەوە: زۆرینـەی دانەرەکـان رایـانوایە دۆزەخ لە قـوڵایی زەویـدایە و بە شـوێن دەروازەکەیدا دەگەڕێن، کە یان لە ئێرلەندەیە یاخود□روونتر لە سـەقڵیە یا

لەباشـووری ئیتاڵیـا بەپێـی نەریتـێ کە پشـتی بە دەسـەڵاتی گریگۆریۆسـی گەورە بەسـتووە. جولیـان دی فیـزلای لە ناوەڕاسـتی سـەدەی دوازدەیەم رایدەگەیەنـێ، ئەوانەی ئـازاری دۆزەخیـان بـۆ بـڕاوەتەوە، پێیـان دەڵـێن" ئیتنییەکـان" بەهـۆی چیـای ئیتنـا(etna)وە. بەڵام عەقڵـی تۆمـا ئەکـوینی بەتونـدی بەر ئەم مەسـەلەیە دەکەوێ و لە پرسـیارکردن وریـایی دەدا، لە کۆمەڵەی تیۆلۆژسـتیدا دەنووسـێ، کە "بـوونەوەری نامـاددی بە شـێوازی ئاسـایی و گوزارشـتکار لەخـۆ لە شـوێندا نـین، کە بەهۆیـانەوە بڵێـین تایبەتمەنـدی جەسـتەکان لەوەدایە لەوێ بـن، بەڵام هەر لەوێشـن بە شێوازێکی تایبەت، کە مەحاڵە ئێمە بە تەواوی بزانین چۆن چۆنییە".

بەڵام سەبارەت بە ئازارەکان کە تیاچووەکان تووشـی دەبن، هانـدەرێ بـووە بـۆ سـەرهەڵدانی تیـۆرگەلێ لە ژمـارە نـایەت و سـەختە تێیانـدا تیۆلۆژستەکان بتوانن جڵەوی خەیاڵدانی خۆیان بکەن. ناودارترین پۆلێنێک بۆ ئەم ئازار و ئەشکەنجانە، ئەوەیە کە لە روونکردنەوەکەی هۆنۆریۆس دوتۆندا هاتووە، کە نۆ دانەیان بەخەیاڵدا دێنێ: ئاگر، سەرما، مارە زلەکان، بۆگەنی، ژاوە ژاوێک گوێ کەڕ دەکات، تاریکییەک کە هێندە چڕە دەکرێت دەستی لێبدرێ، شەرم، بینینی سەری قێزەونی شەیتانەکان، زنجیری ئاگر کە ئازارچێژەکـان دەبەسـتێتەوە. دەبـێ لەپشـت ئەم چەنـدانەوە، دڵەڕاوکێـی ورووژانـدنی ئـازارێ بخـوێنینەوە کە تووشـی ویـژدان و پێـنج هەسـتەکە دەبێت.

ئەوپەڕی هەوڵـدانێ کە بـۆ بەعەقڵانیکردنـی دۆزەخ درابـێ، بێگومـان هەوڵەکەی تۆمـا ئەکوینی بـووە، لەگەڵ ئەوەشـدا سەراسیمەیی ئەم رەبەنە دۆمینیکـانیە لە زۆر خاڵـدا سـەری هەڵـدا، وەک پرسـی شـوێنی دۆزەخ کە پێشـتر باسـمانکرد. لە چەنـدین شـوێنی جیاجیـادا چۆتە سـەر مەسـەلەی دۆزەخ، لە" کـۆمەڵ دژ بە نەتەوەکـان" (١٢٦٣-١٢٦٤) لە چارەسـەری

مەسـەلەی خـراپەدا(١٢٦٦-١٢٦٧) لە کـۆمەڵەی تیۆلۆژسـتی(تەواو نەکـراوە ١٢٧٤).

تۆمـا ئەکـوینی رق لێبـوونەوەی خـۆی بـۆ خەیـاڵ و گێڕانەوەکـان رادەگەیەنـێ و تەنیـا پشـت بە پەڕاوی پیـرۆز دەبەسـتێ، ئەو دەتـوانێ بە سروشـتی ئەو شـوێنانەمان بناسـێنێ، ئەم تیۆلۆژسـتە هەوڵدەدا وەڵامـی هەموو پرسیارە گەورەکان بداتەوە کە: کەی؟ لەکوێ؟ چۆن؟ بۆ کێ؟ تا کەی؟ دواجاریش پرسیارە ئازاربەخشەکە، بۆچی؟ دەیورووژێنێ.

کەی؟ هەر لەدەسـپێکی سـاتەوەختی مەرگەوە، وەک ئەنجـامێکی قیـامەتیی تـایبەت، قیـامەتی کۆتـایی بـۆ سـاتی ئاهەنـگ گێڕانـی فەرمـی دوادەخرێـت، کە تیایـدا ئەنجامەکـان رادەگەیەنـرێ. لەکـوێ؟ هەروەک لە شـوێنێک. چۆن؟ تیاچووەکان دوو جۆر ئـازار دەچێژن: ئـازاری دۆزەخ و ئازاری هەستەکان. یەکەمیان تەواو فیکرییە، وێنا ناکرێت بەڵام تۆقێنەرە: هەسـتێکە کە تێیـدا ئـازارچێژ بـۆ هەتـا هەتـایە لە خـودا جیـادەبێتەوە، دووەمیش ئـامرازەکەی ئـاگرە، ئاگرێک کە خودا بەتایبەتی ئەفراندوویەتی بۆ سووتانی گیـان و جەسـتە پێکەوە. ئـازارە جۆراوجۆرەکـان کە دەقەکـان لەبارەیانەوە دەدوێن، دەبێ واتا رۆحییەکەی وەربگرین. بۆ کێ؟ بۆ هەمـوو ئەوانەی لە دۆخی گوناهێکی کوشندەدا دەمـرن، ئەوانەی دەمـرن بێئەوەی بەئاو پاکژ بکرێن، منداڵەکان و بتپەرستەکان، تەنیا ئەوانەن کە گیرۆدەن بە گونـاهە بنچینەییەکەوە، ئەمـانە بەرەو ئۆلیمپۆس دەچـن، کە تەنیـا ئـازاری دۆزەخ دەچێژن. تا چەندێ؟ بۆ هەتـا هەتـایە، ئەو مەسـەلەیەی کە بێگومـان پرسـیاری کۆتـایی بەدوادا دێـت: بـۆچی؟ یـان راسـتتر: چـۆن دەکرێـت بـۆ خـودایەک کە لەوپەڕی بەزەییـدایە، ئەشـکەنجەی هەمیشـەیی بەسـەر درووستکراوی تایبەتی خۆیدا بدات؟ تۆمـا ئەکوینی دەستدەکات بە پاسـاو هێنانەوە و هەر خودی ئەم پاسـاوە زۆرانە، سـەرچاوەی سەرلێشـێواوی و

سەراسیمەبوونیەتی. ئەو هۆکارانەی دەیخاتەڕوو، خاوەن سروشتێکی لۆژیکی تەواون، لۆژیکێکی ئەبستراکتی سارد و سڕ. دەستەوسانە لە وەڵامدانەوەی پرسیارێک کە سۆزداری بێت و عەقڵانی نەبێت. ئەڤینێک کۆتایی نایەت لەلایەکەوە و لۆژیکێکی وێنەییش لە لایەکیترەوە: پرسیارگەل و وەڵامگەلێ کە لە یەک ئاستدا نین و وەڵامە ئەکادیمییەکانی تۆما ئەکوینیش ناتوانێت نەیارەکانی دۆزەخ رازیی بکات. ئەوە گەلێ زۆرە، گوناهی کوشندە تەنانەت پرەنسیپی سیستەمی گەردوونیش سەراوژێر دەکا، هەڵەیەک کە راست نەکرێتەوە، سزاکەی هەر دەکرێت هەتا هەتایی بێت. کاتێ مرۆڤ لە دۆخی گوناهی بنچینەییدا بێت، مانای وایە بەوپەڕی خواستی خۆی هەڵوێستێکی هەڵبژاردووە، کە بە هێزە تایبەتییەکانی خۆی ناتوانێ لێی دەرچێ. گەر درووستکراو بۆ هەتا هەتایە بژی، مانای وایە درووستکراو لە سەرووی درووستکار دانراوە، کاری رەها و بژاردەی یەکلاکارانە بۆ بێپایان یەک بەدوای یەکدا دێن. ئەمەش هەروەها واتای وایە کە پێویستە سەرکۆنەی قیامەتی هەتا هەتایی بکرێت. ئازار و ئەشکەنجە لەگەڵ شکۆی کەسی سوکایەتی پێکراودا راستەوانە دەگونجێ: خراپەکاری بەرانبەر بە خودای هەتاهەتایی، شایانی ئەشکەنجە و ئازارێکی هەتاهەتاییە. درووستکراوی هەڵوەریویش ناکرێ بە بێبەزەییەکی بێسنور ئازار بچێژێت. کەواتە پێویستە ئەمە بەوە قەرەبوو بکرێتەوە، کە ئەشکەنجەدان بەردەوام بێت.

بیروباوەڕ واتە نمایشکاری فەرمی بۆ باوەڕ(ئیمان) تەنیا شتێکیی بنەڕەتیی لەم هزرانە وەرگرتووە، ئەویش بەلەسەرەخۆیی و وریاییەوە. ئەوە یاسای باوەڕی سەدەی چوارەم بوو. بۆ یەکەمجار لە یاسای باوەڕی سەدەی چوارەمدا باس لە" ئەشکەنجەدانە هەتاهەتاییەکان" کراوە. لە ساڵی ٥٤٣ کۆڕی کۆستەنیتینە بیروباوەڕی ئەپۆکستازی قەدەغە کرد.

دەبێت چاوەڕێی ساڵی١٢٠١ بین تا پاپا ئینۆقنتیۆسی سێیەم جەخت لە بوونی ئازاری دۆزەخ و ئازاری هەستەکان دەکاتەوە، لەکاتێکدا کۆڕی لاتران لە ساڵی ١٢١٥ و کۆڕی لیۆن لە ساڵی ١٢٧٤ جەختیان لەسەر هەتاهەتایی بوونی ئازارەکان دەکردەوە.

دواجار کۆڕی فلۆرەنسا لە ساڵی ١٤٣٩ بە فەرمی ئەوەی ڕاگەیاند، کە ماوەیەکی زۆر بوو تیۆلۆژستەکان خەڵکیانی پێ فێردەکرد" کڵێسای ڕۆمای پیرۆز بە بڕوایەکی پتەوەوە ڕای‌دەگەیەنێ و پەسەندی دەکات، کە نە بتپەرستەکان و نە جولەکە و نە بێباوەڕان و نە هیچ کەسێ کە بڕوای بە یەکتاپەرستی نییە، بە ژیانی هەتاهەتایی بەهرەمەند نابن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوانە لەناو ئاگری هەتا هەتاییدا بە نەمری دەمێننەوە، کە سازدراوە بۆ شەیتان و فریشتەکانی، گەر پێش مەرگیان لەسەری یەک- نەگرن".

کەواتە دۆزەخی کریستیانی شوێنی خۆی گرت، ئیتر دەرەنجام و جیاوازی وورووژاند و جۆش و خرۆشی شوێنکەوتوانی وەئاگا هێنایەوە.

## بەشی شەشەم
## لقەکانی دۆزەخی کریستیانی

دۆزەخـی کریسـتیانی کە باشـیش ئامـادەکراوە، بەڵام بەتەواوەتـی دیاریی نەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە چاخی ناوەڕاست بووە نموونەیەک کە ناکرێـت لە پـێگەی کەمبکـرێتەوە، چـونکە خـۆی بەسـەر هەسـتی تـاکەکەس و بانگەشـەکارانی ئایینیدا دەسـەپێنێت. لە سـەرەتای سـەدەی حەوتەم، ترادیسـیۆنی ئیسـلامی لەسـەر ئاسـتێکی فراوان سـوودی لـێ- وەرگـرت، بەڵام لە رووکەشـە میللیـیەکەدا خـۆی لـێدەپاراسـت، ئەوەی پەیوەسـتە بە کێشـەی سـەرەکیی (نەمری)یەوە، پێدەچێت لە بەرانبەریدا دوودڵ بێت. لەنێو جەرگەی کریستیانیدا بەشێوەیێ ریشەیی لە سەرەتای سـەدەی دوازدە، هەنـدێ بزاڤـی بـێبـاوەڕیی کەوتـنە رەخنەگـرتن لە دۆزەخـی فەرمـی، کە فـراوان دەبـوو، لقێکـی کاتیشـی لێبـۆوە، ئەویـش پاکژکارە.

### ١- دۆزەخی ئیسلام: رۆژی دوایی

قورئانی پیرۆز روانینێکی بۆ دۆزەخ هەیە، کە بەڕوونـی رێکخـراوە و لەگەڵ توخمەکانی میتۆلۆژیای رۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت و بیروباوەڕەکـانی جـولەکە و گـاور لێکچـوونێ لەنێوانیانـدا هەیە. لەکاتێکـدا پەیمـانی نـوێ لەسـەر ئەم مەسـەلەیە زۆر تەمـومژاوییە و گەلـێ وتووێژیشـی لە بیروباوەڕی کریسـتیانیدا وروژاند، رێنماییەکـانی قورئـان بە سـاکاری و

کاریگەرییەکی وردەوە هات، کە هانی باوەڕێکی دەستەکۆیی پتەو دەدا. بەڵام رستە مەجازییەکان، دواتر بوونە سەرچاوەی سەراسیمەیی، لەکاتێکدا وا پێویستی دەکرد زانایانی ئایینی لێکدانەوەیەکی مەجازی بۆ بکەن. وێنە رەمزییەکان هەمیشە بە تەمومژاوی هاتوون، وەک لە زۆرینەی ئایینەکاندا وایە: وا دانراون تا خەیاڵ بەرەو شتێ بڕوات، گوزارشت لێکردنی ئاسان نەبێت و ببێتە پەردەیەک بۆ لێکدانەوەی وشە بە وشەی. هەروەختێ قورئانی پیرۆز وێنەی ورد بەکاردێنێ، لێکدانەوە رەمزییەکەی لەلایەن فتوادەرانەوە ئاریشەی زۆر ورد دەورووژێنێ، بەتایبەتی کاتێ زنجیرەیەکی درێژ لە فەرموودە و چیرۆکی ئایینی و شرۆڤە و کتێبە هەڵبەستراوەکانی بۆ زیاد دەکرێت.

هێڵە گشتییەکانی چارەنوسی تاکەکەس، دیار و نەگۆڕە: پاش مردن گیانی کەسە مردووەکە، لەبەردەم دوو فریشتەی مونکیر و نەکیر دەوەستێت، لەسەر بیروباوەڕی پرسیاری لێ‌دەکەن، گەر نەیتوانی وەڵامبداتەوە و شایەتومان بێنێت، تووشی مامەڵەیەکی خراپ دەبێت و شوێنی ئایندەی لە دۆزەخدا نیشان دەدەن، جێگەشی لە گۆڕدا، دیوارە تەسکەکانی خنکێنەر دەبن، تەنانەت خەریکە دەیهاڕێ، ئەوە ئەشکەنجەی گۆڕە. لە کۆتایی دنیا، قیامەت هەڵدەستێ و ئیسرافیل فوو بە شەیپوورەکەدا دەکات، هەموو خەڵک لە گۆڕەپانێکی فراواندا حەشر دەکرێن، گەرماییەک بەسەریدا زاڵە تاقەت پڕوکێن، دوای چاوەڕوانییەک کە رەنگە ٤٠ ساڵ بخایەنێ، خودا بە ئاشکرا دادگایی هەموو مرۆڤێ دەکات، دوای ئەوەی تەماشای تۆماری کەسیی دەکرێ، کە هەموو شتێکی تێدا نووسراوە، لەو کارانەی کەسە مردووەکە لە ژیاندا کردوویەتی. بەدوای ئەودا تاقیکردنەوەی ترازوو دێت: هەموو تۆماری گوناهەکانی دەخرێتەسەر تایەک و تایەکەی دیکەش پارچە کاغەزێکی

لەسەر دانراوە، کە شایەتی لەسەر نووسراوە، ئەم پڕۆسەیە بڕیار لە ئەنجامەکە دەدات. ئەوجا کەسی بڕوادار لەنێو بەخششدا نغرۆ دەبێت، بە رادەیەک لە باسکردن نایەت. بۆ مردووش هەیە تەنانەت گەر حوکمی تیاچوونیشی بەسەردا درابێت، ئومێدی بە بەزەیی خودا هەبێ، ئەمە گەر بێتو لە خراپەکاران بێت، کە کەسانێکن هێشتا بە وردی شوناس نەکراون، قورئان دەیانخاتە سەر لوتکەی چیایەکی نێوان بەهەشت و دۆزەخ. هەندێ دەق باس لەوە دەکەن کە پردێکی باریک وەک موو، تیژ وەک شمشێر، ئەویش پردی(سیرات)ـە کە خراپەکاران ناتوانن بیبڕن، ئیبلیسەکان خۆیان بەدامێنی ئەوانەوە دەگرنەوە.

**٢- دۆزەخی ئیسلام: ئەشکەنجە:**

تیاچووەکان بەهۆی شەیتانەکانەوە بەرەو دۆزەخ دەبرێن، ئەم شوێنە کە خودان(مەبەستی نووسەر خاوەنی زەمین و ئاسمانەکانە) دەسەڵاتی بەسەریدا هەیە، پێکهاتەیەکی ترادیسیۆنی ئاساییە، ژمارە(٧) و چەندجارەکانی رۆڵی سەرەکی تێدا دەبینن: حەوت دەرگا و حەوت قات، گەرما تێیدا حەفتا ئەوەندە لە قاتێکەوە بۆ قاتێ خوارتر زیاد دەکا. کۆمەڵەی تیاچووەکان ٧٠٠٠٠ فریشتە رایاندەکێشن. لەبەردەم دەروازەکەدا، خودان ٧٠ جار بانگ دەکا. دۆزەخ ناوی جۆراوجۆری هەیە، بەڵام بڵاوترینیان ئاگر و گڕ و جەهەنمە(لە وشەی-Ge Hinnom وەرگیراوە).

ئەشکەنجەی سەرەکی ئاگرە و مەزنترین گوناهیش لە چینەکانی خوارەوە سزا وەردەگرێت. ئەشکەنجەکان چەندبارە زیاد دەکەن، هەروەک لە کریستیانیشدا هەیە: ملوانکەی ئاگریی، قەڵغان لە زفتی گڕگرتوو، پۆشاکێ لە ئاسنی تاوگرتوو، دارەمەیت لەکانزای گەرم تا پلەی سپیبوونەوە، لاقای(مەبەستی نووسەرئەو ئاگرەیە کە لە گڕکانەوە

قوڵپ دەدا و دێتە دەرەوە وەک رووبار رێ دەبڕێت) بە قەقنەس بوو لەژێر پێدا کە ناو مێشک دەکوڵێنێ، ئەژدیهای چنگ بەگڕ، ئوقیانوسێ سیخناخ لە دووپشکی زەبەللاح پێوەدانەکانیان هێندە بەسوێن، ئازارەکەی دە ساڵ درێژە دەکێشێ.

دۆزەخ ماوەی یەکجار دووری هەیە: گەر بەردێ لە قاتی یەکەمەوە فڕێ بدرێتە خوارەوە، تا دەگاتە بنی حەفتا ساڵ دەخایەنێ. هەموو شتێ تێیدا لە کات و لە شوێن بێسنوورە: جەستەی بەفەلاکەتچووەکان دەکشێن بۆ ئەوەی هێندە فراوان بێ بەشی هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەک بکات. هەموو کارێ چەند سەدەیەک درێژە دەکێشێ، لەکاتێکدا کات لە بەهەشتدا دەچێتەوە یەک. دانیشتووانی دۆزەخ دەتوانن، دانیشتوانی بەهەشت ببینن و ئیرەیی بە بەختەوەرییان ببەن، بەڵام ئەوان ئەشکەنجەی دۆزەخ نابینن.

مەسەلەی کات بەوردی دیاری نەکراوە، قورئانی پیرۆز(هەتاهەتایی) بە وشەی ماوەکان دیاری دەکات، کە گەر بە تاک بەکاربهێنرێ هەر(ماوە)یەک بە(٧٠) ساڵ هەژمار دەکرێ، گەر بە کۆش بەکاربهێنرێ(ماوەکان) ئەوا مانای هەتا هەتاییە. لەلایەکی ترەوە ئایەتی(١١ و ١٠٧) لە سورەتی(هود) تروسکاییەک لە ئومێد دەردەخات" **خالدين فيها (النار) ما دامت السماوات و الارض الا ما شاء ربک فعال لما يريد**".

ئایندە دیارنەکراوە بە پێچەوانەی ئەوەی لە ئایینی گاوراندا هاتووە، بێگومان هەریەکەیان لە کۆتاییدا بۆچوونێکی هەیە، رێبازی ئیبن سەفوان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە رۆژێ لە رۆژان دۆزەخ نامێنێ، وەک هەموو راستییەکی دروستکراو، خودا یەکتای رەهایی خۆی دەگەڕێنێتەوە(مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە کۆتایی دێت بەو

بیروباوەڕانەی هاوەڵیان بۆ خودای گەورە دادەنا، چیدیکە قسەیەک نامێنێت بێجگە لە تاک و تەنیایی خودا)، لەکاتێکدا ڕێبازەکانیتر ئارەزوویان وایە کە بڵێن ئەشکەنجەدان بۆ هەتا هەتاییە و کۆتایی نایەت.

**٣- بێباوەڕی و دۆزەخ:**

بڕواهێنان بە دۆزەخ لای گاورانی سەدەکانی ناوەڕاست، ڕووبەڕووی بەرگرییەکی بەردەوام بۆوە لەنێو ناوەندی بێباوەڕاندا، بەتایبەتی لای مانەوی و شوێنکەوتوانیان لە ئەورووپا. ئەم ڕەوتە لە خانەوادەی نۆستیسزم[٧٠] لقی لێبۆوە، کە بەتەنیا لقێک نین لە کریستیانی، بەڵکو ڕەگوڕیشەی لەسەر ئەملا و ئەولای هزری گریکی و فارسی و پەرستشە نهێنییەکان موتربە بووە و گەشەی کردووە، کە لە سەدەکانی یەکەمینی کریستیانی ئامادەییان هەبووە. چەمکی نۆستیسزم لەسەر دوالیزمی گیان-جەستە، چاکە-خراپە خۆی ڕاگرتووە، ئەم دوو دەستەیە، دوو خواوەندی یەکسان لە هێز جڵەویان دەکا. خواوەندی چاکە جیهانی ڕۆحانی ئەفراندووە، خواوەندی خراپەش جیهانی ماددی درووستکردووە، کە گیانە یەخسیرەکەی تێدا دەژی. لێرەوە دۆزەخ بریتییە لە ژیانی ئێستا، خودی گیانیش زیندانییەکە لەم جیهانەدا، کەوای بۆ دانراوە بەجەستەوە ببەسترێتەوە لەگەڵ خواستیشی بۆ ڕۆڵ بینینی

---

٧٠: نۆستیزم یان عیرفانی، کە قوتابخانەیەکی بیروباوەڕیی یان فەلسەفی چارەسەردارە، لە دەوروبەری سەدەی یەکی زایینی هاتۆتە ئاراوە، بەڵام هەندێک سەرچاوە وای بۆ دەچن، کە ڕەگوڕیشە و سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ سێ سەدەی پێشتری زایینی، بە تایبەتی لە کۆمەڵگەی ئەسکەندەریی(ئەو شوێنانەی لەژێر چنگی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا بوون) وەک پاساوێک بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی کۆنی میسرییەکان لە ئیمپراتۆریای ڕۆمانیدا شان بە شانی ئایینەکانی لۆکاڵی. عیرفانی چ دژبەیەکییەکی لەگەڵ ئایینەکانی یەکتاپەرستیدا نەبووە، بەڵام لەلایەن کڵێساوە هەر لە سەرەتایەوە دژایەتی کراوە و هەوڵی خامۆشکردنی دراوە.

زیـاتر(التقمص). ئەم چەمـکە لە کۆتاییـدا لەگەڵ چەمـکەکەی لـۆکریس و قەلەقیـیە وجـودییەکەی یەکدەگـرێتەوە. ئەم جیهـانە شـوێنی جـووڵەیەکی بـــێپەروایە، ملـــکەچە بـــۆ کـــۆمەڵێ یاســـای نـــادادوەرانە، کە هەر ساتەوەختێکی لە رەوتی بێچەندوچووندا(حەتمیەت) بەرەو مەرگ، ئەوی پێشووی دەڕمێنێ.

مانەوییەکـان کە لقێکـی جیـابۆوەن لە بزاڤـی ستیســزم لە ســەدەی سێیەم، ئەم جیهانە دۆزەخییە وا وەسف دەکەن، کە جیهانی تاریکییەکانە، هێــزە شـــەڕەنگێزەکان بەڕێــوەی دەبەن و قەلەقێکـــی دۆزەخـــی تێــدا دەورووژێـنن. بەمجـۆرە یەکـێ لە سـروودەکانیان بـۆ خواوەنـدی رۆح بەردەوام دەبێ:

لە قولایی ئەم عەدەمە، رزگارمکە
لە هەڵدێرە تاریکەکان کە هەموو شتێکی ئاوابوونە
بێجگە لە ئەشکەنجە و برینی بەسۆ، چ شتێ نییە
بۆ تکا، هاوەڵێ.. فریادڕەسێ نییە
هەزار جار هەرگیزا و هەرگیز، نییە رزگاربوون
هەموو شتێ لە تاریکیدا نغرۆن
هەموو هاتوویەک لێی دەدرێ
تا لەنێو برینا نغرۆ دەبێ
بێوارێکە بەهۆی وشکانی، سوتاوێکە بەهەوای گەرم
هەرگیز سەوزایی تێدا نییە
کێ لەم شوێنە رزگارم دەکا،
لەهەموو شتێکی کە بریندارم دەکا
کێ دەربازم دەکا لەم قەلەقە دۆزەخییە؟

بەلای نۆستیســزمەکانەوە، دەربــازبوون خــۆی لە شــارەزابوونی مەعریفەی راستیدا دەبینێتەوە، کە بۆ هەموو مرۆڤێ ڕێکدەکەوێ بەپێی سروشتە پاکەکەی. بەپێی ڕێنماییەکانی مانی، هەموو ڕەگەزێکی ماددی بۆ هەتا هەتایە زیندانی دەکرێ لەنێو تۆپێکدا لەگەڵ گیانەکاندا کە هێشتا پاکژنەبوونەتەوە. ئیبیونیت کە گرووپێکی دیکەی نۆستیسزمین، بڕوایان وایە چارەنووسی خراپەکاران، بێجگە لە تیاچوون و فەوتان هیچی دیکە نییە.

کاتارییەکـان[٧١] و ئەلبێجییەکـان[٧٢]، کە میراتگرانــی ئەم ناوەنـدانەن، تێگەیشتنێ روونیان لەهەمبەر دۆزەخ نەبوو. لە ئاکامی لێکۆڵینەوەیەکی فـراوان، کە جـاک فـۆرنێ-ی لێکـۆڵەر لە دادگەی پشـکنین لە سـەرەتای سـەدەی چـواردەیەم لە مۆنتـایۆ کردوویەتـی، دەرکەوتـووە کە خەڵـک لە کەرتــی باشــووری ڕۆژاوای فەرەنســا، بڕوایــان وایە گیانەکــان پــاش ســاتەوەختی مــردن، سەرلێشــێواو دەبــن، ئەوجـا دەچــن بـۆ بارەگــای حەوانەوە. لەکۆتـایی جیهـان هەمـوو کەسـێ رزگـاری دەبـێ، دۆزەخـیش

---

٧١: بزووتنەوەیەکی ئایینی بوون کە ڕەگوڕیشەی عیرفانییان هەیە، لە نیوەی سەدەی دوازدەوە سەریان هەڵدا، کڵێسای ڕۆمانیی کاتۆلیکی ئەم گرووپەی بە لادەر لە ئایینی کریستیانی ناوبردووە. شوێنی ئەم بزاڤە باشووری فەرەنسا و زۆرینەی ناوچەکانی ڕۆژاوای ئەورووپا بووە.

٧٢: لە کۆتایی سەدەی دوازدە لە باشووری فەرەنسا. گرووپێک بەناوی ئەلبیجییەکان پەیدابوون، بەناوی ئەو شارۆچکەیەی تێیدا پێکهات کە شارۆچکەی ئەلبی-یە لە هەرێمی تۆلۆز. ئەم گرووپە مەسیحییە کەوتبوونە ژێر کاریگەری(مانی)ی شازادەی فارس، کە خۆی بە پێغەمبەر دەزانی و لە سەدەی سێی زایینییەوە دەستی کردبوو بە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکەی کە بریتی بوو لە ئاوێتەیەک لە ئایینەکانی(زەردەشتی- کریستیانی- بودایی)، واتە هەڵگری بیروباوەڕی مانەوی بوون و لەگەڵ کریستیانیدا گرێیاندابوو، بۆیە پاپای ڕۆما لە ساڵی ١٢٠٠ی زایینی ئەمانەی بە لادەر لە ئایینی کریستیانی ناوبرد و هەڵمەتی تەفروتوناکردنیان دەستی پێکرد، کە لەناوچوونی ئەم گرووپە سەدەیەکی خایاند.

تەنیا بۆ ئیبلیسەکانە، بۆ یەهودای ئەسخەریۆتی و لای هەندێکیش بۆ جولەکەیە. بەڵام بۆ بڕواداران، مانەوەی رۆح لەزیندانی جەستەدا، ئەوە دۆزەخە. لە کۆتایی جیهان رزگاربوونی تەواو دێتەکایەوە، بەهۆی گڕگرتنی هەر چوار توخمەکەوە، ئاگرێکی سەرتاسەری کڵپە دەسێنێ و خراپەکاری تێدا سەرنگوم دەبێ.

بە پشتبەستن بە کتێبێکی سەرچاوە نەزانراو، کاتارییەکانی ئیتالیا هەموو دۆزەخێکی ئاسایی رەتدەکەنەوە، لەبەر هۆکارێکی سادە، ئەویش ئەوەیە کە جیهان درووستکراوی لۆسیڤەرە، کە شوێنێکی بۆ ئەشکەنجەدان تێدا دانەناوە بۆ خۆی و شوێنکەوتەکانی. هەر دەمە و بانگەشەکارێ سەرهەڵدەدا کە لە رێنماییەکاندا قاڵ دەبنەوە و گومان دێننە ئاراوە. جولیانی ڤازلیانی لە سەدەی سیازدەیەم دەڵێ: هەندێ لە گاورەکان نکوڵی لە بوونی دۆزەخ دەکەن. ئەمە تێبینییەکە خەڵوەتکارێکی ئینگلیزی بەناوی ریچارد رۆڵا کە لە سەدەی چوادەیەمدا ژیاوە، جەختی لەسەر دەکاتەوە. پاکژکار لە دۆزەخ زیاتر، رەخنەی جۆراوجۆری لەسەر وروژێنراوە.

### ٤- لەدایکبوونی پاکژکار:

جاک لۆگۆف لە کتێبێکی ناوداریدا، بنەماکانی چەمکی پاکژکار-ی دانا، کە لە سەردەمی باوانی کڵێسادا گەرایەکی بچووک بوو. پێدەچێ دابەشبوونی دوالیزمی دۆزەخ- بەهەشت، بۆ هەندێ وەک ئەوە وابوو کە لە سەرەتا و رەگوڕیشەوە بیری لێکرابێتەوە.

زۆرێ لە بڕواداران، هەرچەندە شایانی دۆزەخیش نین، بەڵام لەکاتی مردنیاندا لەدۆخێکدا نابن، راستەوخۆ بەو بەختەوەرییە بەهرەمەند بن، کە دانیشتوانی بەهەشت چێژی لێدەبینن و پاکژییەکی رەها دەخوازن. ئیدی لێرەوە بیرۆکەی پاکژبوونەوە هاتۆتەئاراوە. بیرۆکەی

"پـاکژبوونەوە" بـۆ پـاککردنەوەی گونـاهە سـەرپێیەکانە بەهـۆی" ئـاگری پاکژکار"ەوە کە لە ئاگری دۆزەخ جیاوازە، هەروەک پاکژکارەکەی ساینت پاتریک.

بـۆ هەنـدێ کەس پاکژکـار، بـریتییە لە چینـی سـەرەوەی دۆزەخ کە زۆرجار لە چەمکی بتپەرستیدا، بۆ دنیاکانی دۆزەخی چین لەسـەر چین بەدی دەکەین. هەندێکی تر وا دەبینن کە پاکژکار لەگەڵ دەستەواژەیەکی تەوراتیـدا کـۆکە کە ئەویـش( ئـامێزی ئیبراهیم)ـە، شـوێنی حەوانەوە و چـاوەڕوانی، کە چاکەکـاران پـێش هـاتنی مەسـیح لەوێ نیشـتەجێ دەبـن. ئەوانە ئێستا لە بەهەشتن، شوێنەکانیان چۆڵ بووە تـا سـەرلەنوێ جێیـان پڕ بکرێنەوە.

بیرۆکەکە وردە وردە خۆی دەسـەپاند، لەگەڵ پێشـڤەچوونی یاساشـدا پشتیوانییەکی بەهێز دەکرا، کە پێشـتر ئاماژەی پێدرا، هەر لە سـەرەتای سـەدەی یـازدەوە، لەگەڵ بـوونی تێکڕاگەلێکـی رێژەیـی لەنێـوان تـاوان و سـزادا و هەڵکشـانی ناوەنـدەکانی بـۆرژوای بازرگـانی: بەرە بەرە لێکچـوونی نێـوان تۆمـاری کـارە خـراپ و چاکەکانمـان و دەفتەرەکـانی لێپێچینەوە بەرەو گەشەکردن دەچن. لە کۆتـایی سـەدەی دوازدەدا رائـول ئەردان بەشـێوەیەکی تەواو و یەکلاکـارانە، سیسـتەمەکەی بەمشـێوەیە پوختکردەوە:

" ئەوانەی لە دۆخـی چـاکەخوازی تەواودان، لەپـاش مـردن یەکسـەر دەگوازرێنەوە بۆ بارەگای بەختەوەری و پێویستیان بە نوێژ و نزای ئێمە نیـیە، بەڵکـو ئـێمە سـوود لە نوێژەکـانی ئەوان وەردەگـرین، ئەوانەی لەدۆخـی مامناوەندیـدان سـەبارەت بە چـاکەخوازی و پابەنـدن بەوەی بگەڕێنەوە بـۆ بـڕوا و تـۆبەی بـێگەرد، بە تەواوەتـی پـاکژ نـین، بەڵکـو لە شـوێنی پـاکژبوونەوە پـاک دەکـرێنەوە، بێگومـان خێرکـردن و مەراسـیم-

کردن بۆ ئەمانە بەسوودە. لەپاش مردن دەستکەوت و کردەوەی نویٚ چ سوودێکیان پیٚناگەیەنێت، بەڵکو ئەوەی سوودمەند دەبیٚ، کردەوەکانی پێشوویانە، بەڵام ئەوانەی سەرکۆنە کراون، شایانی ئەو بەخششە نین. ئێمەیەک کە برایانین، نازانین کیٚ پێویستی بە نوێژە و کێش پێویستی پێی نییە، ئەم نوێژە سوود بە کیٚ دەگەیەنیٚ و بە کێشی ناگەیەنیٚ، پێویستە لەسەرمان هەموویان وەلانێین، لەنێویاندا هەیە کە ناکریٚ لە بارودۆخیان دڵنیابین تا سڵاوات و نەزر و مەراسیمە پیرۆزەکانیان پێشکەش بکەین. ئەم پێشکەشکردنەمان شوکرانەبژێرییە بۆ ئەوانەی کە زۆر پاکن، هەروەها کەفارەتیشە بۆ ئەوانەی کە لەدۆخێکی مامناوەندیدان. بەڵام بۆ تیاچووەکان، دەبێتە جۆرێک لە پرسەنامە بۆ ئازیزان. دواجار ئەم پێشکەشکردنانە بۆ ئەوانەی پێشکەشیان دەکرێت بەسوود بن یان نا، هەرچۆنیٚ بیٚ بۆ ئەو کەسە بەسوودە کە بە بڕوایەکی پتەوەوە پێشکەشی دەکا، ئەوەشی نوێژ بۆ کەسیٚتر دەکا، وەک ئەوە وایە بۆ خۆی کردبیٚ"(دانراوە لاتینییەکانی باوانی کڵێسا، بەرگی ١٥٥، کۆمەڵەی ساڵی ١٤٨٥).

لەسەرەتای سەدەی سیازدەیەم پاپا ئینۆکنتیۆسی سێیەم، لە یەکیٚ لە ئامۆژگارییەکانیدا بەبۆنەی جەژنی سەرجەم ساینتەکان، بە فەرمی رایگەیاند کە شوێنیٚ بۆ پاکبوونەوەی ئەو گوناهبارانە هەیە کە بە ئەشکەنجەدانی هەتاهەتایی سزا نەدراون، لە ساڵی ١٢٧٤ کۆڕی لیۆن بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆژیانە دایڕشت و خستیەڕوو.

سەرهەڵدانی پاکژکار تا رادەیەکی زۆر بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی کڵێسا هات، کە لەڕێگەی سیستەمی لیٚبەخشین لە گوناهەکان، هەڵوێستی نێوەندگیری نێوان خودا و خەڵکی بەیەکەوە بەستەوە. دەکریٚ ئازار و ئەشکەنجەی پاکژکار بە خوێندنەوەی سەڵاوات و ئەنجامدانی مەراسیمە

پیرۆزەکان سووک بکرێت، لەبەرانبەر کڕینی بە بڕێکی دیاریکراو. زۆری نەبرد پاکژکار کەوتە نێو بازاڕی بازرگانییەوە و بووە بابەتی سازش-کردن و قازانجی بۆ پیاوانی ئایینی فرێدەدا. ئەو بازرگانانە ئامۆژگارییەکی ساینت لۆقایان بەجێدەگەیاند" بەپارەی حەرام هاوڕێکان درووست بکەن، تەنانەت گەر پارەش نەما، ئەوا لە ماڵە هەتاهەتاییەکاندا پێشوازیتان لێدەکەن".(لۆقا ٩،١٦).

ئەم پشتیوانییە بۆ دەسەڵاتی کڵێسا و دەسخەڕۆکردنی(ئیستیغلال) دارایی بۆ راستییەکی رۆحانی، هۆکاری بەگژداچوونەوەیەکی توند بوو، کە بێباوەڕەکان لەسەر پاکژکەرەوە بەرپایان کرد. نیشانەکانی ئەمەش لای ئارس لە سەدەی یازدەیەمینەوە دەبینین. لە ساڵی ١١٣٤ قوتابییەکی پیار دۆبرۆس بەناوی هێنری، بەهۆی نکوڵیکردنی لە بوونی پاکژکار راگیرا. دوای ئەوە بە چەند ساڵێک ساینت بێرنار بەتوندی دژی ئەم"ئاژەڵە پیسانە" و ئەم " نەخوێندەوارە تەنگە ئەستوورانە" وەستایەوە، کە دژ بە پاکژکار بوون. لە کۆتایی سەدە لەبەرهەمان هۆکار، بێرنار دی فۆنکود بەگژ والّدییەکاندا[٧٣] چۆوە. لە سەدەی چواردە لە باکووری

---

٧٣: ئەمانە گرووپێکی کریستیانی بوون لەلایەن پیتەر والّدۆوە لە فەرەنسا دامەزرا، کە دواتر ئەم گرووپە بەهۆی نزیکیان و یارمەتیدانیان بۆ هەژاران، ناونران(هەژارانی لیۆن)، هاوکات پێشیان دەگوترا(والّدییەکان)، ئەندامەکانیان دوو دوو بە بازاڕەکاندا دەسووڕانەوە و ئینجیلیان بۆ خەڵک شیدەکردەوە. ئەسقوفی لیۆن بەم کارەیان نیگەران بوو، بڕیاریدا کە والّدۆ و هاوەڵەکانی لەکار و خزمەتکردنی ئینجیل رابگرێت، بۆیە لە ساڵی ١١٧٩ی زایینی دوو لە(هەژارانی لیۆن) چوونە رۆما بۆ لای پاپا و سکاڵای حاڵی خۆیان کرد. کڵێسا لە والّدۆ بەهێزتر لە ساڵی ١١٨٤ لە ئەندامێتی کڵێسا دەرکرا و دواتر لەلایەن کۆڕبەندی فێردنا-وە پەیامێک بڵاوبۆوە کە نابێت خەڵک گوێ لە قسە و روونکردنەوەکانی گرووپی والّدییەکان بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا رێنماییەکانیان رووبەرێکی فراوانی داگیرکردبوو لە هەرێمەکانی فەرەنسا و ئیتالیا و ئیسپانیا. لە ساڵی ١١٩٨ لەژێر کاریگەریی ئەسقوف نورین، ئیمپراتۆری ئەڵمانیا(ئۆتۆی چوارەم) بڕیارێکی ئیمپراتۆریی دەرکرد بۆ نەهێشتنی

ئیتالیا هەمان ئەو رەخنانە دەبینینەوە، دەرک بەوە دەکەین کە مەسەلەی بەخشینەکان، چ رۆڵێکی دیاریکراوی بینیوە لە بەرپاکردنی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی لە سەدەی شانزەیەم.

بابەتی دۆزەخ و سەرجەم لقەکانی، ئەوانیش بابەتگەلێ بوون لە بوارەکانی دیکەدا جێی دەرفەت لێهێنان بوون.

---

والدییەکان و بەو جۆرە هەتا کۆتایی سەدەی حەڤدە، ستەم و چەوساندنەوە لەسەر ئەم گرووپە مەسیحییە بەردەوامی هەبووە.

# بەشی حەوتەم

## وەگەڕخستنەکانی دۆزەخ
## لە سەردەمی ناوەڕاستەوە بۆ سەدەی شازدە

دۆزەخ بابەتێ بووە لە بەهەشت زیاتر خەیاڵدانی مرۆڤ کاری لەسەر کردووە، کاتێ پرسی بەختەوەریی هەتاهەتایی دەورووژێنرێ، کە گیانە باشەکان لێی بەهرەمەنددن، هونەرمەنددان و زانایانی مۆراڵ و مژدەدەرەکان چەندێ سەرسامی دەیانگرێ، هێندەی ئەوەش درێژە بە قسە دەدەن و لە وەسفکردنی ئازارەکاندا داهێنان دەکەن. ئەوی پەیوەستە بە بەهەشتەوە، چێژێکی جەستەیی ناشیاوە و لە دەرەوەی پرسەکەیە، ئەمە وایکردووە تا رادەیەکی زۆر رێگر بێ لە توانای وەسفکردن. بەهەشت تێڕوانینێکی وا بەدەستەوە دەدات کە بێزارکارێ کوشندەیە، هەرچەندە مژدەدەرەکان کۆششی ئەوە دەکەن وێنەی پەناگەیەکی پێببەخشن، بەڵام روانینە یۆتۆپیاییەکان تا رادەیەک بەرەو بێزاریی ئاراستە دەگرن.

خەسڵەتی دۆزەخ لەوەدایە کە بە تەواوی جڵەوی بۆ خەیاڵ شل-کردووە، چونکە هەموو ئەو ئازار و ئەشکەنجانەی باس دەکرێن، تەنیا زادەی خەیاڵن و هەمیشەش بۆ گەیشتن بە راستی، دەستکورتە و وا ئامادەکراوە کە نیشاندەری ئازارێ بێت سنووری خەیاڵی تێپەڕاندووە. ئەمە ئەوەیە کە لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەم ڤنسان هۆدری لە نامیلکەیەکدا رایگەیاندبوو، کە چەندین ئامۆژگاری لەخۆ گرتبوو بە

ڕێنماییگەلێ ڕازاندبوویەوە و پێیان دەگوت" کتێبخانەی مژدەدەرەکان"، ئەو گوتویەتی: لەگەڵ ئەوەشدا پێویست ناکات هۆشداری لەو زێدەڕۆییانە بدەین، کە ئامۆچیاری[٧٤] کریستیانی دەبێ لە هەموو بارێکدا خۆی لێ دوورەپەرێز بگرێت، لەم بوارەدا ترسی نەگەرەکە، چونکە هزری مرۆیی دەرکی بە قەبەیی ئەشکەنجەدانەکانی دۆزەخ ناپژێ.

هونەرمەندان و نووسەران و مژدەدەران ئەوپەڕی ئازادن بۆ بەرجەستەکردنی توندترین دیمەنێ، کە نیشاندەری ئەشکەنجەکانی جیهانەکەیتر بن، بە مەبەستی ئەوەی ترسی رزگاربوون لە دۆزەخ بڵاوبکەنەوە. رزگارکردنی گیانەکان، بە ترساندنیان لە رۆژی دوایی: هەموو زێدەڕۆیی و پێوەنانێک بۆ تۆقاندن، ڕێپێدراوە لەلایەن سەرپەرشتیاری ئایینی بەپاساوی ئەوەی ئامانجێکی چاک بەدی دێنێت. هەر لە چەپاندنی سادیزمانەی نێو ئەدەبی میللییەوە تا دەگاتە خەمی دوودڵی سۆفییەکان، بەراستیش ترس توانیویەتی شاکارگەلێ لە هزری مرۆڤایەتیدا بەرهەم بێنێت.

**1- دۆزەخی هونەرمەندان**

پەیکەرتاشەکان یەکەمین کەسێ بوون ناهەمواری جیهانی دۆزەخیان لە چوارچێوەی رۆژی دوایی، بۆ باوەڕداران بەرجەستە کرد. سەدەی دوازدەیەم کە پەتەوبوونی توخمەکانی بیروباوەڕی سەرەکی و نووسینەوە و داڕشتنی مەزنترین دنیابینی رەبەنیانەی بەخۆوە بینی، بەڵام لە بەرەکانی رۆژاوای کڵێسا، دیمەنە شاکارەکان لەبارەی جوداکردنەوەی رزگاربووان و تیاچووان زەقدەکرانەوە. ئەوانە لەلایەن دەستەیەک ئیبلیس و ئاژەڵی سەیرەوە، بەرەو کونە زەبەلاحەکەی

٧٤: ئەو کەسەی ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەداتە دەوروبەری خۆی.

دۆزەخ کێشدەکران، هەروەک لە بۆڵیۆ و کونک و کۆربای و سان دنیس و لاون و شارتەر و پاریس دەبینرێن.

ئەو دیمەنەی کە لە زۆر دۆخدا دەمێنێتەوە، لە سەدەی سیازدەدا دەست بە فراوانبوون دەکا، تا وای لێهات ئەشکەنجەکان بەوردی و تاکەکەسییانە دیاریکراو بوون. هونەرمەندان لە ئۆتان هەروەک لە ریمس رادەستی ئارەزووەکانی خۆیان دەبوون و لە نەریتەکان دەرباز دەبوون: لە تابلۆکاندا تەرازوویەک دەردەکەوێت لەکاتێکدا شەیتان پێ دەهاوێتە سەر تای خراپە، بە ئاسانی تیاچووەکان بەهۆی گوناهەکانیانەوە دەناسرێنەوە، هەروەک چۆن پارەپیسەکان بە جزدانە هەڵواسراوەکەی گەردنیانەوە دەناسرێنەوە، وێنەکان بورجی شەیتانەکان نیشان دەدەن، کە لەنێو ئاگردا قرچەی دێ، بۆقەکانیش لکاون بە مەمکی ژنەکانەوە.

لە چاخی ناوەڕاستدا، جیهانی دۆزەخ باڵادەست دەبێ. لە سەدەی چواردەوە بۆ سەدەی شانزە، هەندێجار وادەردەکەوێ کە دۆزەخ لە دەورانی کارەسات و رووداوەکاندا کە جەنگ و رشانەوە و برسێتی و شۆڕش و دیاردەی پەرستنی شەیتان و بزاڤەکانی رەتکردنەوەی ئایینی و کۆمەڵایەتی تێدا بەرپا دەبێ، تەواوی سەر رووی زەوی دەتەنێتەوە. لە دەستنووسە نەخشەدارەکاندا دیمەنەکانی ئەشکەنجەدان، کە لەژێر کاریگەریی دنیابینیی رەبەنەکاندا کێشراون و بە رادەیەکی زۆر لە وردبینی، دیکۆمێنتارییان تێدا ئەنجامدراوە. نایابترین دەقی ئێرلەندی، سەرچاوەی خەیاڵەکەی دۆزەخ بووە، کە لە دەوروبەری ساڵی ١٤٢٠ دانراوە بەناوی(بەپێزترین کاتژمێرەکانی دۆق بێری)، لەکاتێکدا ڤیرار لە فەسڵەکانی تایبەت بە ئەشکەنجەدانەکانی دۆزەخ لە کتێبی( هونەری ژیانی باش و مردنی باش) لە ساڵی ١٤٩٢، سەرلەنوێ دیمەنی دنیابینییەکانی ساینت پۆڵس دەگێڕێتەوە، کە گوناهە سەرەکییەکان سزای

شــیاویان بــۆ دانــراوە: مــار و بــۆق ئەنــدامە گوناهکارەکــانی زاوزێ هەڵدەلووشــن، بە هەڵــپەوە دەیــانخۆن، لووتبەرزەکــانیش ئــازاری خلــۆکە دەنۆشــن، کە هێمــای دەورانــدەورانی قەدەرە، کەســە تووڕەکــان پــارچە پــارچە دەکــرێن و دووبــارە پارچەکــان بەیەکەوە دەلکێنەوە، ڕژدەکــان لە کــانزایەکی تــواوەدا نغــرۆ دەکــرێن و مەممــون[٧٥] دەیانکــا بە شیشــدا، دەعــاجەنە باڵــدارەکان، تەمبەڵەکــان قــووت دەدەن و تفیــان دەکەنەوە. ئیرەیی بەرەکان لە ڕووبارێکی بەستەڵەکدا خول دەخۆن و پێچ دەدرێن، ئەوجــا لە ڕووبــارێکی ئــاگردا نغــرۆ دەکــرێن، بەردەوام ئیرەیــی بەوانە دەبەن، کە هاوچارەنووسیان نین.

ئەم خەیاڵانە کە(ڕۆژمێری سەرپەرشتیاران) فراوانتر بڵاوی کردنەوە، لەدەوروبەری ســاڵی ١٥٠٠ دووبــارە بە پێوەرێ گەورە و گوڕ و تینێکی تۆقێنەرانەی عەقڵبەرانەوە، لە چوارچێوەی دیواربەندی کاتدرائی گەورەی ئەلبی وێنەی کێشرایەوە. لەهەمان سەردەم پەیکەرسازیی شــەپۆلاوی[٧٦]، بەپشتبەستنی بەهەمــان ســەرچاوە، ئەم خەیــاڵانەی جوانتر دەنەخشــاند: لەکڵێســــای ســــان مــــاکلۆ لە ڕوان، تیاچووەکــــان بە خلــــۆکەیەکەوە دەبەسترێنەوە، هەمان دیمەن لە دەوروبەری ساڵی ١٤٧٠ لە کاتیدرائیەی نانــت دەبینیــنەوە، کە ئیبلیســەکان جەســتەی گوناهکــاران بە یەکتــرەوە دەبەستنەوە. لە هەرێمــی بریتانیــای فەرەنســا، لە کڵێســا و پەرستگەکانی هەردوو ســەدەی پــانزە و شــانزە، زیــاد لە(٥٠) دیمەنــی دۆزەخ هەژمــار

---

٧٥: لە ئەدەبی جوولەکە و کریستیانیشدا ئەم ناوە بە خواوەندی دەستکەوتە ماددییەکان دێت، یان ئەو سامانە حەرامەی کە مرۆڤی پێ دیل و سەرشۆڕ دەکرێت.

٧٦: مەبەستی نووسەر لە پەیکەرتاشییەکە کە وێنەی کەسەکان زۆر بلیمەتانە بەرجەستە دەکات.

کـراوە، کە زۆرینەیـان بەهەنـدێ جـۆش و خرۆشـەوە مـامەڵەی لەگەڵـدا دەکەن، هەروەک لە کیرناسکلیدین لە نێوان ساڵانی ١٤٦٠ و ١٤٦٥.

ئەم دیمەنـانە سـەرباری هەمـوو شـتێ، بـوونە نمـوونەیەکی نەگۆڕ لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، هونەری نەمری ڕێنیسانس نوێی کردنەوە و ئامـادەی کـردن. لە ئیتالیـا و لە سـەرەتای سـەدەی چـواردە، ئۆرکاگنـا سوود لە خەیاڵە نایابەکانی دانتی وەردەگرێ، کە دواتـر فـرا ئەنجلیکۆ و پـاولۆ دی نیـری و بـۆچیللی-یـش بەهەمانشـێوە سـوود لە توخمەکـانی وەردەگرن. دیمەنـی ڕۆژی دوایـی لەگەڵ سیگنۆریللی و بەتـایبەت لەگەڵ مایکـڵ ئەنجیلـۆ، ڕەهەنـدی زەمینـی و تراژیـدیی وەردەگـرێ، سـەرەڕای دووبـارە بەکارهێنانەوەیـان بـۆ هەنـدێ تـوخمی میتۆلـۆژیی وەک بەلەمەکەی کارون[٧٧].

ئەم دیـمەنە لای فیلمنگیەکـان[٧٨] زۆر روونتـرە. جـۆری نەخشـی ئەم وێـنە کێشـراوانەی ڤـان ئایـک یـان میملینـگ، دەرخـەری لێـکئـاڵانی ئەو کۆمەڵانە زەقدەکاتەوە لە جەستەی لاواز و ڕەنگ پەڕیوی سـەرەولنگ-کراو لە چیای ئاگر یاخود نغرۆ لە دەمی تونێکی چەقیو لەنێو دوو لاقی کـراوەی پەیکەرێکـی زەبەلـلاح، تابلۆکـانی جیـرۆم بـوش و خـانەوادەی بروگیـل شـاهێدی لەسـەر گواسـتنەوەی دۆزەخ بـۆ زەوی دەدەن.

---

٧٧: گریکەکان بڕوایان وایە کە هادیس دەکەوێتە جیهانی ژێر زەوی و پێنج ڕووباری تێدایە کە ئەکیرۆن یان ئەشیرۆن یاخود کارون یەکێکە لەو ڕووبارانە، لەوێوە ڕۆح سواری بەلەمی شارۆن دەبێت بۆ ئەوەی لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە، بەڵام شارۆن داوای کرێی لێ-دەکات، بۆیە یۆنانییەکان لە کۆندا دراوێکیان دەخستە ناودەمی مردووەکانیان تا بۆ ئەو کاتە بەکاری بێنن.

٧٨: کۆمەڵە میللەتێکن لە باکووری بەلژیکا دەژین و ناوچەکەیان پێیدەگوترێت فلاندەر. لە کۆندا لەچەندین بەشی فەرەنسا و هۆڵەندا ژیاون، نزیکەی ٥٥%ی دانیشتوانی بەلژیکا پێکدێنن.

مەسـەلەکە لێرەدا دۆزێکی ئـایینی نییە. دۆزەخ لە(بەهەشتی چێژەکان)ی جیـرۆم بـوش دەبێـتە دۆخـی مرۆیـی بەشـێوە خەرەفـاوییەکەی، لای خانەوادەی بروگیلیش بەشێوەیەکی واقیعی‌تر لەگەڵ دیمەنگەلێکی شـووم و پڕ لە پیرەژنـی ناشـیرین و سـوتماک و کوشـتارگەکان، کە یەکێکیـان شەرەفی نازناوی"دۆزەخ"ی داوەتە بروگیل.

ئەوی جێـــی سەرســـووڕمانە لە ســـەرەتای ســـەدەی حەڤـــدەوە، دیمەنەکانی دۆزەخیی بزر دەبن، تـابلۆی تیاچووەکـان-ی رۆبنز بە یەکێ لە دوایەمـــین دیمەنەکـــانی ئەمجـــۆرە دادەنـــرێ، لەبەرئەوەی کڵێســـای چاکســـازیی کـاتۆلیکی مکـووڕ بـوو لەســـەر رێکخســـتنی ئەم لێشـاوەی خەیاڵ، سوور بوو کە لەمەودوا حەقیقەتی ئیمانی ببێتە پێوەری سەرەکی و گرنگیشە سنوورێک بۆ هەراوهۆریـای ئەمجۆرە رەوتـانە دابنێت: وەک دوورخستنەوەی توخمەکانی میتۆلۆژیای بتپەرستی و گێڕانەوەی دۆزەخ بـۆ سـنووری جیهـانی دووەم. نمـوونەی تەقلیـدی رێکخسـتن و دانـان و نـوێنەرایەتی‌کردنـی سیســـتەمی خـودایی، کە پێویســـتە بەســـەر زەویـدا باڵادەست بێت، لەگەڵ دنیـابینی شـەیتانی و خراپەدا یەک‌ناگرنەوە، کە لە سەدەی شانزەدا دەیبینین. وێنەی دۆزەخ بـزر نـابێ لەکاتێکدا سیماکانی تەڵەکەبازی و کاریگەرییەکانی بەرەو نەمان دەچن.

**٢- دۆزەخ بابەتێکی ئەدەبییە:**

دۆزەخ بە بـابەتێ ســەرەکی دادەنـرێ لە یەکـێ لە گەورەتـرین کـارە ئەدەبییەکـانی ســەدەکانی ناوەڕاسـت، ئەویش(کۆمیـدیای خواوەنـد)ە، کە سـاتی دانـانەکەی بەنێوانی ١٣٠٨ و ١٣٢٠ دەستنیشـان‌کراوە. لە راسـتیدا خەیـاڵیی دۆزەخـی تەنیـا ســێ یەکـی کۆمیـدیاکە پێـک‌دێنـێ، بەڵام لە تێڕوانینی نەوەکانی پاشترەوە، ئەو یەک لەسەر سێیە، ئەوەندە گرنگە کە بەهۆیەوە دوو لەسەر سێیەکەی دیکەش کەوتوونەتە نێو ناوانەوە.

"خەیاڵی دانتییانە" هەمیشە بە خەیاڵە دۆزەخییەکان هەژمار کراون. دانتی نەریتی سەفەرکردن بۆ دۆزەخ دەگەڕێنێتەوە و بە بلیمەتی خۆی ڕەهەندێ بێوێنەی پێدەبەخشێ، بەهرەکانی دەتەقنەوە و بەلێشاو دیمەنی تۆقێنەر و تۆکمەیی فیکریی و لۆژیکی و هێماگەری خەیاڵبەخش و چەقبەستوویی ئایدیۆلۆژیی هەڵدەڕێژێ. تۆقین لە دنیای دانتیدا لە هاوسەنگی نێوان توخمە پێکهاتووەکانیدا خۆی حەشار دەدا، کە ئەویش توندوتۆڵی لۆژیکیی و هێماگەریی و ئایدیۆلۆژییە، کە ئەگەرێکی قێزەون دەخاتە سەر ئەشکەنجەدان. لەپاڵ خەیاڵە ڕەبەنییە شێواو و تارادەیەک کاڵفام و کەم متمانەییەکەیدا، تەلارێکی هزری تۆکمەمان هەیە لەسەر شێوەی(کۆمەڵەی تیۆلۆژیی)ی تۆما ئەکوینی، کە کۆمیدیای دانتی وردی پۆڵێنکردن و لقبەندیی و تۆکمەیی لێوەرگرتووە. ئەوەی لە دۆزەخی دانتیدا مەترسیدارە، ئەشکەنجەدان لەگەڵ گوناهەکاندا تا ڕادەیەکی دوور لە وردیی دەسازێن، کە مەحاڵە بە ترس و لەرزێکی مەزنەوە ئەم پرسیارەی لێنەکەوێتەوە: بۆچی نا؟

دانتی یەکەمجار بۆ ڕاڕەوی دۆزەخ دێتە ژووری، شوێن پێی ڤرجیل-ی شارەزای دێرین هەڵدەگرێ، لەوێ حەشاماتێ ترسنۆک و دوودڵ و ڕیسوا هەن، ئەوانەن کە هەرگیز لە هەڵبژاردنی سەنگەری خۆیاندا بوێر نەبوون، تا کۆتایی لەپشتی ئاڵایەک دەسووڕێنەوە بێئەوەی هەوڵ بۆ ئامانجێ بدەن، ئەوانە پێوەدانی زەردەواڵەیەک دەیانورووژێنێ. پاشان دەچێتە قاتی سەرێ لە دەرەوەی شورای شاری دیس، لەوێ ئەوانەی خۆیان دابووە دەست ئارەزووە سەرشێتەکانیان، لە پێنج بازنەدا هەڵ-دەفڕن. ئۆلیمپس بازنەی یەکەمە، ئەوانەی تێدایە کە بە پاکژبوونەوە ڕازیی نەبوون، ئازار ناچێژن بەڵام بە تاسەوەن بۆ بەختیاری بێئەوەی بتوانن پێی بگەن. بێجگە لە منداڵ هەموو ناودارەکانی مێژووی

بتپەرستیی دێرین لەوێن، لە هۆمیرۆسەوە بۆ ئەکلیدس و لە ئەفلاتۆنەوە بۆ هۆراس. ئەمە وا دامەزراوە و ریزبەندی بۆ کراوە کە رەچاوی مەترسیداریی گوناهەکانیان بکرێن، بازنەی بێڕەوشتەکان، دواتر چاوچنۆکەکان، پاشان رژدەکان، ئینجا هەڕەشەدەران، پاشتر بازنەی بەدخووەکان دێت.

لەو کاتەدا دەریاچەی ستیکس دەبڕێ بۆ ئەوەی بگاتە دۆزەخی ناوخۆ، شاری دیس، کە گوناهبارە راستەقینەکان لە چوار بازنەدا زیندانی کراون و بازنەکانیش دابەشکراون بۆ ناوچەی لاوەکی. بازنەی بێباوەڕەکان، بازنەی دەستدرێژکارانی توندوتیژیی، دەستدرێژکاران بۆ سەر کەسوکاری نزیکیان، بۆ سەر خۆیان(خۆکوژەکان)، بۆ سەر خودا(بێ ئایینەکان) بۆ سەر سروشت(نێربازەکان)، بۆ سەر هونەر(سووخۆرەکان).

دوای بڕینی بەربەستە مەزنەکە، بازنەی هەشتەم دێت، بازنەی تەڵەکەبازان کە خەڵکیان فریو داوە و بێ پێچ و پەنا متمانەی خۆیان بە کەس نەداوە، ئەوانیش زۆرزانەکان، زیناکارەکان، شەمعونییەکان[٧٩]، بازرگانیکارەکان بە شتە رۆحییەکان، عەڕافەکان، بازرگانیکار بە مادده

---

٧٩: نەوەی شەمعونی کوڕی یەعقوبن، کە یەکێکن لەو چەندین تیرەیەی لە قورئانی پیرۆزدا ناویان بە ئەسباتەکان هاتووە، کە خودی ئەم وشەیە عیبرییە و بە(شەبت) دەیخوێننەوە، بەمانای گۆچان دێت یاخود ئەو کۆمەڵەیەی کە سەرۆکەکەیان بە گۆچان بەڕێوەیان دەبات، ئەمانە لە سەرەتادا(١٢) سەبت یان تیرە بوون لەژێر دەسەڵاتی پادشا سلێماندا ژیاون، پاش مەرگی حەزرەتی سلێمان، ناکۆکی کەوتۆتە نێوانیانەوە و بوونەتە دوو بەشەوە، یەهودا و بنیامین داویانەتە پاڵ رحبعام-ی کوڕی حەزرەتی سلێمان و شانشینی یەهودایان درووستکردووە، کۆمەڵەکەی دیکەش کە ١٠ تیرە بوون، شانشینی ئیسرائیل-یان پێکهێناوە.

هۆشبەرەکان، پیس و چەپەڵەکان، راوێژکارگەلێکی ناپاک، ئاژاوەچییەکان، ساختەکاران، تەواوی ئەمانە لە چاڵێکی بازنەییدان.

دەگاتە بازنەی نۆیەم، بازنەی ناپاکان، لە پشت دەڤەری زەبەللاحەکانە، بۆ ئەوانەیە کە خراپەکارییان بەرانبەر کەسانێ کردووە متمانەیان پێدابوون، بۆ ئەوانەیە کە ناپاکییان لەگەڵ کەسوکاریاندا کردووە(کۆمەڵەی قابییەکان) ئەوانەش کە ناپاکییان لە نیشتمانیان کردووە(کۆمەڵەی ئەنتینۆر)[٨٠] هەروا لە میوانەکانیان( کۆمەڵەی پەتلیمۆس) لەوانەش کە چاکەیان لەگەڵدا کردوون(کۆمەڵەی یوزاس).

دواجار دڵی دۆزەخ لە چەقی زەویدا لەخودی لۆسیڤۆرس پێکدێ، لۆسیڤۆرس ئەو دێوەی بۆ هەتا هەتایە یەهودای ئەسخەریوتی(یوزاس) ناپاک و سزادراو بە ئەشکەنجەی کەمەرشکێن، لەت لەت دەکات. دۆزەخ لە دەفرێکی زەبەللاح دەچێ بە تەواوی نیوەی گۆی زەوی داگیرکردووە، سەری ئەم دەفرە بەرەو ناوکی لۆسیڤۆرس ئاراستەی گرتووە. لە چەند بازنەیەک پێکهاتووە کە بەپێی گوناهەکان قووڵ و مەترسیدارتر دەبن، زیاتر رەگ لە دەروونیدا دادەکوتن، هەر خودی خۆی رەمزییە.

---

٨٠ : ئەم کۆمەڵە ناوە لە مێژووی ئایینیدا هەریەکەیان سەرگوزەشتە و پەندێکی لێوەرگیراوە، بۆ نموونە قابین کوڕە گەورەی حەزرەتی ئادەمە، ناوەکەی بەمانای ئاسنگەر دێت، هەستا بە کوشتنی قابیلی برای، لە ئایینی ئیسلامدا ئەم ناوە بە(قابیل) دەخوێنرێتەوە، ئەمە وەک نموونەیەک دانراوە لەسەر ئەوانەی ناپاکی لە کەس‌وکار و برایان دەکەن، یان یوزاس کە یەکێکە لە حاخامەکان و دوای ١٥٠ ساڵ لە مەسیحییەت، هەستا بە کۆکردنەوەی قسە گواستراوەکان لە کتێبێکدا بەناوی(مەشنا) کە وەک هێمایەک لای کریستیانەکان دانراوە بۆ ئەوانەی چاکەیان لەگەڵدا دەکرێت، بەڵام بە ناپاکی وەڵام دەدەنەوە، بەو پێیەی کە ئایینی کریستیانی هات بۆ چاکەی مرۆڤایەتی بەڵام یوزاس هەستا بە زیندووکردنەوەی تەلمود و چیرۆکی حەزرەتی موسا وەک رێگریکردنێک لە بڵاوبوونەوەی ئایینی کریستیانی.

دۆڕاوەکان چارەنووسێکیان دارشت خۆیان هەڵیانبژاردبوو، لەگەڵ سروشتی کارەکانیاندا دەگونجێ. هەر ئەمەشە وای لێدەکات ئەگەرێکی قێزەون بێت. بەو جۆرە تووڕە و بێزارەکان کە لە ژیانیاندا نکوڵیان لە بەزەیی کردووە، یەکتری دەهاڕن: ئێستا بواری پاڕانەوەیان بۆ نەماوە، ئەو دزانەی سامانیان لە خەڵکیتر دەبرد، ئێستا کەسایەتییەکانیان لێ-دادەبڕن و بەردەوام دۆخی دیکەیان لەبەردەکەن، چییان نەماوە بێجگە لە کۆمەڵە سێبەرێ، مارەکان پڕییان دەدەنێ.

ئاگر تەنیا لە دوایەمین بازنە بوونی هەیە، بەڵام بارودۆخ لەو بازنەیە خراپترینە. ناپاکەکان لە شەختەی رووباری کۆسیت نغرۆ دەکرێن، تەنیا کەللەسەرە رەنگ وەنەوشەییەکانیان دەردەکەوێت کە بە چاوە ناشیرینەکانیان دەڕوانن. ئەوانە بوونەوەرێکی شەپرەلێدراون، خامۆشی مەرگێکی هەتا هەتایی لەو شوێنەدا یار و یاوەریانە، هەروەک چۆن گوناهەکان دڵی لەکارخستوون و ناتوانن وەڵام بدەنەوە، کاتێ دانتی پرسیاریان لێدەکا، لەتاو سەرما ناتوانن وەڵام بدەنەوە، فرمێسک لە بیناییاندا دەیبەستێ.

لەوێ زۆر کەسایەتی مێژوویی دەبینرێن، لەنێویاندا چەندین پاپا هەن وەک سیلستین-ی پێنجەم لەنێو ترسنۆکەکاندایە، نیکۆلای سێیەم لەنێو ئەوانەدایە کە بازرگانی بە شتە رۆحییەکانەوە دەکەن...

" بەرمیلێ کونی تێنەبووە، کە تەوقەکەی شل بووبێتەوە یان یەکێ لە لایەکانی لێبووبێتەوە وەک ئەو کونە گەورەیەی من بینیم، لە چەناگەیەوە تا خوارەوەی پشتی، شەقی بردبوو، هەناوی لەنێوان هەردوو رانیدا شۆڕببۆوە، سییەکانی ئەو توورەکەیەش کە خۆراک دەکاتە پاشەڕۆ دەرپەڕیبوون، کاتێ سەیرم دەکردن، هەردوو کەلەکەی خۆمم گرتبوو، سەری بۆم بەرزکردەوە و بەدەستی سینەی کردەوە،

گوتی: تەماشـام بکە چۆن پـارچە پـارچە دەبـم، ببینـە چـۆن لەت لەت دەکـرێم" یەکێکـیتـر لەبەردەمیـدا بەدەم پـڕمەی گریـانەوە تێـپەڕی و ڕۆیشت، ڕووخساری تا خوارەوە شەق ببوو، هەر کەسێ لێرە دەبینیت، لە ژیـانی دنیایـدا چێـنەری گومـان و ئـاژاوەچی و ئاورخۆشـکاری دووبەرەکی بووە، لەبەرئەوەیە ئێستا لێرە پارچە پارچەن. لە پشتمانەوە شـەیتان زۆر بێبەزەییـانە ڕێکمـان دەخـات و هەر کـاتێ خـولی ڕێگەی ئازارەکان تەواو دەکەین، بە شمشێرەکەی لەتمان دەکاتەوە، چونکە پێش ئەوەی دووبارە بچینەوە بەردەستی، برینەکانمان قەتماغە دەبەستن"(٤٢، XXVIII،٢٢).

لەسەدەی پانزەوە بابەتی دۆزەخ بە شێوەیەکی تەمومژاوی مامەڵەی لەگەڵـدا کـراوە. لە سـاڵی ١٤٢٠" بەهەشـتی شـاژن سـیبیلا[٨١]" وەک شوێنێکی گومانلێکراو وێنا دەکرا، کە تێیدا چێژ لە شتە قەدەغەکراوەکان دەبینرێت، چێژە جەستەییەکان، بۆ هەتا هەتایە بێئەوەی هەست بە ئـازار بکـرێ. بەهەشـت تـێکەڵ بە دۆزەخ دەکـرێ لەنێـو ڕاسـتییەکی شـێواوی خاوەن دەنگ و سەدایەکی نوێ. ڤیۆن هەوڵدەدا گاڵتە بە نیشتەجێبوون لە دۆزەخـی پیاوچاکانـدا بکـات، هەروەک لە پەیمـانی کـۆن-دا هـاتووە و دەڵێت: هەروەک بۆی دەچـم هەنـدێک گەرماییەکی یەکجـار زۆر لە پشـت ملیانەوە تاویان دەدا. بەڵام خاوەنی ئەم کۆپلەیە کە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا درا لەگەڵ ڕاگرتنی جێبەجێکردنی سزاکە، لەوە زیـاتر نەچۆتە

٨١: شاژنی ئۆرشەلیم و کچە گەورەی عەموری یەکەم، لە ساڵی ١١٦٠ی زایینی لەدایک-بووە لە خانەوادەیەکی ئایینی، لە ساڵی ١١٨٦وە تا ١١٩٠ پادشای ئۆرشەلیم بووە، لە شەڕی حەتین ڕووبەڕووی سەلاحەدینی ئەیوبی وەستاوەتەوە بەڵام سوپاکەی تێکشکا و لەگەڵ کچەکانیدا بەرەو تەرابلۆس هەڵات. لە ساڵی ١١٩٠ بەهۆی پەتایەکەوە کە بەناو سوپای کریستیانیدا بڵاوببۆوە کۆچی دوایی کرد. ئەم ئافرەتە لەڕووی سیاسییەوە کەسێکی بەتوانا بووە و بلیمەتانە لەگەڵ نەیارەکانیدا جووڵاوە.

نێو قووڵاییەوە، بەڵکو لە مەسیح دەپاڕێتەوە و دەڵێت( گەورەم لە ئاگری دۆزەخ دەربازمکە).

لەسەرەتای سەدەی دواتر، جان لۆمێری بەلژیکی لە"نامەکانی خۆشەویستێکی سەوز"دا ئەویش بۆ دۆزەخ دادەبەزێ، بەڵام دۆزەخەکەی دۆزەخێ گریکی-رۆمانییە. رابلێ لەلای خۆیەوە لە فەسڵی سیەمی کتێبەکەیدا"پانتا گرویل" وێنەیەکی گاڵتەجاڕییانە بەم سەفەرانە بۆ دنیاکەیتر دەکێشێ. ئەپستمۆن کە بەهۆی هاڕاوەی دیامردیس لە پانورچی هاوەڵییەوە، لە مردن هەستاوەتەوە و دەگێڕێتەوە کە ئەو ژیانی لە دۆزەخدا دیوە، شەیتانەکان" برادەری چاکن و لەژێر فەرمانی لۆسیڤۆری بەخشندەدا کاردەکەن. هەریەکەیان ژیانێکی ئارام دەژین و رۆڵێک دەبینن بەپێچەوانەی ئەو رۆڵەی لە ژیانی دنیادا هەیانبووە: دیۆجین لە ژیانێکی پڕ کەیفدا دەژی، ئەسکەندەر خزمەتی دەکا، ئیپیکتیت لەگەڵ شۆخ و شەنگەکاندا سەرقاڵی گەمەیە، کۆرش لە شەقامەکاندا سواڵ دەکا، ڤیۆن دەچێتە بازاڕ و میز دەکاتە سەتڵی ئەحشۆرش کە بە نرخێکی گران خەردەل دەفرۆشێ، تەزار و پۆمپیوس کەشتییەکان بە قەتران دادەپۆشن. کلیۆپاتراش پیاز دەفرۆشێ، بێگومان ئەمە هیچ و پووچی و گاڵتەجاڕییە. بەڵام دەرخەری کەشێکی نوێیە: بێباوەڕیی لەژێر پەردەی دڵ و دەروون باشیدا، دەستیکردووە بە چیرکردنەوەی ددانەکانی " هەروەک فرانسیس راپ تێبینی کردبوو.

لەهەمان سەردەم ئیراسیم نکووڵی لە هەموو راستییەک دەکا کە ئاماژە بێت بۆ راست و درووستیی ئازاری دۆزەخ. ئەو دەنووسێ" دۆزەخ لە دڵەڕاوکێیەکی هەمیشەییدا خۆی حەشارداوە، کە یاوەری گوناهەکانە، ئەمە خۆپاریزیی زانکۆی سۆربۆنی بەشێوەیەکی توند ورووژاند، لە ساڵی١٥٢٦ هەستا بە سەپاندنێک بەسەر مرۆڤدا کە دەبێت

به ئاگری نەمر بڕوای خۆی دووپات بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەکە ڕێی خۆی گرتەبەر، لە ساڵی ١٥٤٢ ئەمبرواز کاتارانی دۆمینیکانی گەڕایەوە و پیادەی کردەوە، لەکاتێکدا جان بۆدان لە کۆتایی سەدە لە(گفتوگۆی نهێنیگەلی شاراوە)دا ڕایگەیاند" گەر سەبووری خودا مەزن بێت، بێبەزەییەکەی تا هەتا هەتایە بەردەوام نابێت".

ئەمەی باسکرا بێجگە لە ئەندێشەی دوو هزرڤانی نائاسایی چیدیکە نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئامۆچیاران تێبینی ئەوەیان کردووە کە ترسان لە دۆزەخ وەک پێشان نەماوە.

**٤- دۆزەخ لە خزمەتی کەشیشایەتی تۆقێنەرانەدا:**

بۆ ماوەیەکی زۆر شوێنکەوتوانی کڵێسای کاتۆلیک، وایان دانابوو کە دۆزەخ بۆ بتپەرست و بێباوەڕ و کافرەکان ئامادە کراوە، دواتر بەرە بەرە لەژێر کاریگەرییەکی تایبەتی ئامۆژگارییەکانی ڕەبەنگەلێکدا، باوەڕ بە ڕزگاربوونی تەواوی کریستانەکان لەق بوو، دڵەڕاوکێیەکی کوێرانە جێی گرتەوە، ئاماژە یەکەمینەکانی لە سەدەی حەوتەمدا لە لیتۆرجای ڤیزیکۆتیدا دەرکەوت، لە سەدەی هەشتەم ناوەڕۆکی یەکێ لە کتێبە پیرۆزەکان، کە هەڵگری ناونیشانی(کتێبە پیرۆزەکانی بۆبیۆ) بریتییە لە نوێژکردن لەسەر گیانی مردوو" تا ڕزگاربن لە شوێنی ئازار و ئەشکەنجە، لە ئاگری دۆزەخ، لە ئاوری تەرتار، بۆ ئەوەی بگەنە بارەگای زیندووان".

ئەم دڵەڕاوکێیە لە نەریتی ناشتنی مردوودا تێبینی دەکرێ، کە لە نزیکترین شوێنی بێ لە کوشتارگە یان میحراب، لەوێدا پاشماوەی شەهیدێک یان سایەنتێک هەبێ، بوونیان هێزی خراپەیان لێ دوور بخاتەوە، کە هەوڵدەدا مردووەکە بەرەو دۆزەخ بەرێت. هەندێ نووسینی سەر تەرمە فەرەنسییەکان شایەتی لەسەر ئەم ترسە دەدەن.

له ڤیەننا ئەوەمان بۆ دەلوێ کە نووسینی سەر کفنێ بخوێنینەوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٥١٥ کە ئاوها نووسراوە: ئەو تەرمەی لەم گۆڕەدا راکشاوە، شایانی ئەوە بوو لە گۆڕستانی کەسە پیرۆزەکاندا بنێژرێ، تووڕەیی تەرتاری لێ بەدوور بێ، لە توندیی ئەشکەنجە پارێزراو بێت.

سیزیردارک بە چڕی کەشیشێتی تۆقێنەرانەی بەکارهێنا، تا جارێتر لە سەدەی دوازدەدا لەنێو ناوەندی رەبەنەکاندا بەمیتۆد کرا، کە بیرۆکەی ئەوەیان بڵاودەکردەوە، دەستەبژێرێک بەهۆی گرتنەبەری ژیانی گۆشەگیری و خوداپەرستییەوە، لەڕزگاربووەکان دەبن، زۆرینە زۆرەکەش لە ریزی تیاچووەکانن. نووسینی سەر گۆڕەکان و دیواربەندییەکان و ئامۆژگارییەکان، هەموو کۆک بوون لەسەر تۆقاندنی بڕواداران. بەو پێیەی چ فاکتەرێک لە ترساندن بۆ مرۆڤی ترساو باشتر نییە، لەبەرئەوە ئامۆچیاران قسە لەسەر دۆخەکانی پەیوەست بە ترسی تایبەتی خۆیان دەکەن، جولیان دی ڤازلای لە ساڵی ١١٥٠ رای‌دەگەیەنێ و دەڵێ" سێ مەسەلە دەمتۆقێنێ، کاتێ ناویان دێنن هەموو دەروونم دێتە لەرزین، ئەوانیش مردن و دۆزەخ و رۆژی دوایی-ن". لەهەمان سەردەم گیوم دی سان تێری لە" ئامۆژگارییە رامانییەکان" دەنووسێ کاتێ هیوای خواست سەردانی دۆزەخ بکا، یەکێ لە فریشتەکان گیانی هەڵگرت، کاتێکیش گەیشتە بەردەم دەرگاکە، بەهۆی گریان و چۆقە چۆقی ددانەکانیەوە، ترسێکی مەزن گرتی، تەنانەت ئاگای لە چوونە ژوورەوەش نەما.

ساینت بێرنار زۆرجار لە ئامۆژگارییەکانیدا گوزارشتی لە ترسی خۆی کردووە و دەڵێ" لە دۆزەخ دەترسم، لە رووخساری خودا دەترسم کە دەستەی فریشتەکانیش لێی دەترسن. لەرز دەمگرێ کە بیر لە

تــوورەیی و توانــای دەکەمەوە، لەو بێــزارییەی لەســەر رووخســاری دروست دەبیّ، بە ژاوەژاوی جیهانێکی جەمبوو، بە سووتانی توخمەکان، بە وەیشوومە، بە دەنگی سەرۆکی فریشتەکان و بە قسە تۆقێنەرەکەی. دەلەرزم کاتێ بە خەیاڵمدا دەگوزەرێ کەڵبەی ئاژەڵە دۆزەخییەکان و هەڵدێری دۆزەخ و ئەو شێرانەی دەنەڕێنن وەختێ دەنیشنە سەر نێچیرەکانیان. لە کرمی قرتێنەر و ئاگری دڕندە و دووکەڵ و هەڵم و گۆگرد و وژەی گەردەلوولەکان دەتۆقم، زەندەقم لە باسکردنی تاریکییەکانی دەرەوە دەچێ( لە ئامۆژگارییەک دەربارەی سروودی سروودەکان). " ناوچەی چوارەم ناوچەی دۆزەخە، ئای چ دەڤەرێ بەخەم و ئازارە، شوێنی ناهەمواریەکانە. ناوچەیەکە دەبێ لێی هەڵبێیت، سەرزەمینی بیرچوونەوەیە، سەرزەمینی بەلا و ناسۆرە، کە تەنیا پشێوی بەسەریدا زاڵە، جگە لە تۆقینێکی هەرمانی چی تێدا نیشتەجێ نابێت، جێیەکە مەرگی خێرای تێدا دەچێنرێ، چی تێدا نییە بێجگە لە ئاگری سووتێنەر و سەرمایەک ئێسک دەشکێنێ، ئازاری ویژدانێ کۆتایی نایەت، بۆنێکی ناخۆش و قێزەون، چەکوشەکان دەکوتنەوە، تاریکی لەسەر تاریکی و ئاویتەیەکی ئالۆز لە گوناهباران و پڵپڵە و زنجیر و سەری ئیبلیسەکان ترس دەخاتە نێو دڵەکانەوە"(ئامۆژگارییەک لەبارەی پێنج بازرگانییەکە و پێنج ناوچەکە).

لە سەدەی پانزەدا ئامۆچیاری میللی، جاک دۆن ڤێتری، نموونەی زیاتری دێنایەوە، کە پڕبوون لە کورتەچیرۆکی ئایینی و تۆقینی دەخستەوە و زەنگی مەترسیی لێدەدا.  رەبەنی دۆمینیکانی -ئێتیان دی بۆربۆن- بەشێ لە کتێبەکەی( وتارێک لە ئامۆژگاری)ی بۆ( نیعمەتی ترس) تەرخان دەکات. خەسڵەت و تایبەتمەندی هەردوو سەدەی چواردە و پانزە، لە قسە زۆریدایە. رەبەنەکانی فەرەنسیسکان و دۆمینیکان

لەبەردەم خەڵکێکی مێشک ماندوو و بێهۆش و شەکەت بەهۆی کارەساتەکانی سەردەمەوە قسە دەکەن، بەڵام لەسەر لایەنە ترسناکەکەی دنیاکەیتر چڕدەبنەوە. رەبەنی دۆمینیکانی ئیسپانی -ڤنسان فیریی- کە ناسراوە بە(فریشتەی خەونەکانی یۆحەننا) سەرکۆنەی گوناهباران و هەڕەشەیان لێدەکا" گەر بیر لە ئەشکەنجەی تیاچووەکان لەو دۆزەخەی بۆ گوناهباران ئامادە کراوە بکەیتەوە، پێموایە هەموو تۆبەکردنێ، هەموو لەخۆبردووییەک، هەموو هەژارییەک، دواجار هەموو ململانێیەک دەکرێ بەرگەی بگریت و ئاسان بێت لە پێناوی ئەوەی خودا لە ئەشکەنجە مەزنەکە رزگارت بکا". هاوەڵەکەی تۆللەر زیاتر واوە دەچێت و دەڵێ" بیر بکەوە هەزاران کەس لە دۆزەخدان، رەنگە ئەوانە هێندەی تۆ گوناهیان نەکردبێت". برایانی سواڵکەر کار بە گوفتار دەبەستنەوە و لە ئازاردا دەسووتێن و هاوار دەکەن، لەتاو گازگرتنی هەندێکیان بۆ باڵی ئەوی دیکەیان، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە چۆن تیاچووەکان پەلاماری یەکتری دەدەن، هەندێک لەوانە بۆ نموونە ئۆکسیر(نامۆ)بڕوایان وایە کە ئەوانە زێدەڕۆیی کردنە و وا نیشان دەدەن، کە خودا قەسابێکی راستەقینەیە.

زێدەڕۆیی لە بەکارهێنانی هەڕەشەدا، لە کارایی ئەو هەڕەشانە کەم-دەکاتەوە: هەرڤیە مارتان لەبارەی ئامۆژگاری لە کۆتایی سەدەی ناوەڕاست، دانەری تێزێکی بەپێزە، تێیدا چەند تێبینییەکی باشی سەبارەت بەزۆری لە پیاوانی ئایینی وەڕوو خستووە، کە بۆیان دەرکەوتووە ئامۆژگارییەکانیان بێهودەیە. بەشێوەیەکی کاتی کاریگەریی لەسەر گوێگران هەیە، بەڵام سەرجەنجاڵیی رۆژانە بەخێرایی جێی خۆی دەگرێ، یان هەستدەکەن کە ناوەڕۆکی ئەو ئامۆژگارییانە، ئەوان ناگرێتەوە و قسەکان ئاراستەی دەرەوەی ئەوانە. لە بیرەوەرییەکان کە لە تۆماری

پیاوانی ئایینیدا، هاتووه" ئای له دژی فلان چه‌نده قسه‌زان بووا!"، " ئای! ئامۆچیار چه‌نده بلیمه‌ت بوو له‌قسه‌کردن ده‌رباره‌ی ده‌ره‌به‌گ و خاتوونه‌کان!". له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا سه‌رده‌می کلاسیکی له چوارچێوه‌ی چاکسازیی کاتۆلیکی، جۆش و خرۆشانێکی له ئامۆژگارییه تۆقێنه‌ره‌کان زیندوو کرده‌وه، به‌ڵام به شێوازێکی ئارامتر.

**٥- دۆزه‌خی سۆفییه‌کان:**

له‌نێو ئه‌وانه‌ی ده‌ست و په‌نجه‌یان له‌گه‌ڵ دۆزه‌خدا نه‌رمده‌کرد، سۆفییه‌کان شوێنێ تایبه‌تیان داگیرکردبوو. فره هه‌ستیاریی و به‌جۆشیی ئه‌زموونی ده‌روونییان، له‌سه‌ر ئه‌م مه‌سه‌له‌یه، هێنده ترس به‌رهه‌مدێنێ، گه‌لێ ئه‌نجامی ده‌روونی ئازاربه‌خش ده‌خاته‌وه، که به‌ئاسانی گوزارشتیان لێناکرێ. به‌مجۆره هێنریک سۆزۆ(١٢٩٣-١٣٦٦) وێنه‌کان زیاتر ده‌خاته‌ڕوو تا بڕوایه‌کی وا له‌مێشکدا بچێنێ که ئه‌شکه‌نجه نه‌مره و سه‌رنجی ئه‌و ئه‌شکه‌نجه‌دانه‌ش ده‌دات، بۆ ئه‌وه‌ی پاڵنه‌رێ بێنێته کایه‌وه جه‌سته به‌رگه‌ی مراندن و ژیانی سکهه‌ڵگوشین بگرێ. له سه‌ده‌ی چوارده بیرۆکه‌ی ترسان له دۆزه‌خ هێنده زاڵ ده‌بێت به‌سه‌ر چله‌کێشی ئینگلیزی(ریچارد رۆڵ)دا، ده‌که‌وێته وڕێنه‌کردن به‌وه‌ی هه‌موو ئه‌وانه‌ی گوناهی جه‌سته‌یان ئه‌نجامداوه، له دۆزه‌خ نیشته‌جێ ده‌کرێن. ئه‌و قوربانیی ده‌ستی کرده‌وه‌یه‌کی سێکسی بوو، به‌رگه‌ی سه‌ختییه‌که‌ی نه‌گرت، به‌خراپی خۆی چه‌پاند و به‌راوردی نێوان گوناهی جه‌سته و دۆزه‌خی کرد و گوتی" ئه‌ی هه‌رزه‌کار، دڵێکی گڕگرتووم هه‌بوو... بینیم ژیانی خه‌ڵک چه‌نده هیچه....ته‌مه‌نم له تۆبه‌دا به‌سه‌ر برد، به‌و جۆره ده‌کرێ بمرم به‌بێ ترس له دۆزه‌خ. خۆم له‌ئافره‌تان به‌دوور گرتووه تا ملکه‌چی ئاره‌زووه‌کانیان نه‌بم".

کتێبی(لەخواترسـی هـاوچەرخ) کە مێـژووەکەی بـۆ سـەدەی پـانزە دەگەڕێتەوە، زۆر نەرمترە، لەخواترسـان لەکتێبی( چاو لە مەسیحکردن) گەیشـتە ترۆپـک، کە دۆزەخ وەک ئـامرازێ سـەبووری بەکـاردێنێ بـۆ یارمەتیدان لەسـەر بەرگەگرتنی ئازارەکانی ئەم جیهانە و ئالیکاریشـمان دەبێ بۆ ململانێمان لەگەڵ گوناهدا. بۆ هەمـوو گوناهێک سزایەکی شـیاو دادەنـێ و بانگمـان دەکـا لەنێویـدا رابمێنـین تـا لە ژیـانی خواپەرسـتیدا یاریدەدەرمان بێ.

بەتـایبەتی ئەگنـاتیۆس دی لویـولا لە سـەدەی شـانزەدا پەنـا بـۆ ئەم پرەنسـیپە دەبـات، کە بەشـی پێنجەمـی کتێبەکەی(ریـازەتی رۆحـی) بـۆ رامانی میتۆدی لەدۆزەخ تەرخان دەکات، لەرێگەی بەکارهێنـانی عەقڵ و هەستەکانەوە وەک یەک:" نوێژ، نوێژی ئامادەکاریی ئاسایی".

پێشـەکی یەکەم: فـۆرمی شـوێن. بەچـاوی خەیـاڵ درێـژی و پـانی و قووڵی دۆزەخ دەبینین.

پێشـــەکی دووەم: ئەوە داوا دەکەم کە دەمەوێ، ئـــاخۆ هەســـت بە ئـازاری دەروون وەک ئەوەی تووشـی تیاچووەکـان دەبـێ، دەبـێ چـۆن بێت، تەنانەت گەر بەهۆی گوناهەکانم خۆشەویستیی گەورە هەرمانیەکەم لەیـاد کردبێـت، بەلانـیکەمەوە تـرس لە ئەشـکەنجەدان یـارمەتیم دەدا نەکەومە نێو گوناهەکانەوە.

خاڵی یەکەم: بەچاوی خەیاڵ ئاگرە مەزنەکە دەبینم، ئەو گیانـانەش کە لەنێو جەستەکاندا دەسووتێن.

خـاڵی دووەم: بەگوێم دەبیسـتم سکالاکان، هـاوار، گریـان و جنێو بۆ حەزرەتی مەسیح و هەموو ساینتەکان.

خـاڵی سـێیەم: بەلـوتم بـۆنی دووکەڵ و گـۆگرد و پیسـیی و گەنیـوی دەکەم.

خاڵی چوارەم: بەهەستی چێژکردنم شتە تاڵەکانی وەک فرمێسک و پەستی و ویژدان تام دەکەم.

خاڵی پێنجەم: بەدەست لێدان دەرک بە ئاگر دەکەم چۆن گیانەکان دەسووتێنێ.

گفتوگۆ، لەگەڵ گەورەمان یەسوعی مەسیح قسە دەکەم، گیانە تیاچووەکانی نێو دۆزەخ دێنەوە یادم: هەندێکیان بڕوایان بەهاتنی مەسیح نەبوو، هەندێتر بڕوایان هێنا بەڵام کاریان بە ڕێنماییەکانی نەکرد، دەیانکەمە سێ دەستەوە: یەکەم ئەوانەی پێش هاتنی مردن، دووەم ئەوانەی لەکاتی بوونی لەسەر زەوی، مردن، سێیەم ئەوانەی پاش هەڵکشانی بۆ ئاسمان. دواتر سوپاسی بەخششەکانی دەکەم، لەبەرئەوەی ڕێی نەدام لە هیچ یەکێ لەو سێ دەستەیە بم و سنوورێکی بۆ ژیانم دانا، چونکە هەتا ئێستا بە سۆز و بەزەیی لەخۆی گرتووم. گفتوگۆکە بە نوێژێکی خودایی کۆتایی پێدێنم.

لە پەیڕەوەکانی ژیانی کریستیانی، ڕاوێژکارە ڕۆحییەکان لەنێوان ترس لە دۆزەخ و سیستەمێکی بەرگری باش ئامادەکراو دژ بە خەتاکاری، یەکبوونێکیان ڕێکخستووە. ئەم هەستە لەلای فرانسوا دی سال دوایەمین بەربەستە دژ بە هێزە خراپەکان، کە زۆر سەرەتاییە، بەڵام گەلێکیش کارایە. پێویستە لەسەر گیان، کە چەندین پێنگاڤی لە ڕێبازە ڕۆحییەکان بڕیوە، پەنا بەرێتەبەر شێوازی بالاتر، بەڵام گەر هێرشەکانی شەیتان بەهێزتربوون یان مرۆڤ لە ژیانی ڕۆحی نوێ بوو، پێویستە لەسەری کە ئەقڵی لەسەر وەحشەتناکەکانی دۆزەخ چڕبکاتەوە. ئەمە ئەوەیە کە لە ساڵی ١٦٠٩ لە(دەروازەیەک بۆ ژیانی لەخواترسی) ئامۆژگاری پێ دەدات کە پەیڕەو لە شێوازێ بکرێت خاوەن میتۆدییەکە لە شێوازی ساینت ئەگناتیۆسدا نییە:

**ئامادەکاریی:**

١- خۆت بدەرە دەست مەزنیی خودا.

٢- لەخۆبردوو بە و داوای یارمەتیی لیٚبکە.

٣- بیر لە شاریٚکی تاریک بکەرەوە بە گۆگرد و قەترانی گەنیو دەسووتیٚ، پڕ لە خەڵکە و ناتوانن لیٚی بچنە دەرەوە.

ئەگەرەکان:

١- بارودۆخی تیاچووەکان لەنیٚو هەڵدیٚرە دۆزەخییەکەدا وەک حاڵی دانیشتوانی ئەم شارە کارەساتبارەیە، کە هەموو هەست و ئەندامەکانیان بەدەست ئازاریٚکەوە دەناڵیٚنیٚ، لە باسکردن نایەت، چونکە لە ئەنجامدانی گوناهدا بەکاریان‌هیٚناوە، بەو جۆرە ئەشکەنجەدانەکان دادەبارنە سەر تەواوی ئەندام و هەستەکانیان، کە هۆکاری گوناهەکان بوون: چاویان دیٚشیٚ بەهۆی تەماشاکردنە هەڵە و خراپەکانیان، کە دیمەنی شەیتانیی قیٚزەونیان پیٚ بینیوە، گوێیەکانیان گل دەکا کە بە قسەی هیچ وپووچ ئاخنیبوویان، بیٚجگە لە گریان و ناڵە و ئاهی کڵۆڵانە چی‌دیکە نابیستن، هەستەکانی دیکەش هەروان.

٢- ئەشکەنجە و ئازاریٚ گەورەتر لەم هەموو ئازارانە بوونی هەیە، ئەویش بیٚبەشبوونە لە نەمریی خودا و لەدەستدانی، بۆ هەتا هەتایە لە بینینی خودا بیٚبەش دەکریٚن. گەر بیٚبەش‌کردنی ئەبشالوم لە بینینی رووخساری داودی باوکی ئازیزی لە تاراوگە سەختتر بیٚ، دەبیٚ خودایە چەند رەنج بەزایە بین، کە بۆ هەتا هەتایە لە بینینی رووخساری شیرینی تۆ بیٚبەش بین.

٣- بەتایبەتی رابمیٚنن لە نەمریی ئەم ئەشکەنجەیە کە وادەکا بەرگەی دۆزەخ نەگرین. ئای مخابن! کیٚچیٚ لە گوێماندا یان گەرمایەکی سادە شەوی کورتمان نیگەران و دریٚژ دەکا، شەویٚکی دریٚژی هەتاهەتایی

لەگەڵ دنیایەک ئازار و ئەشکەنجە، چەندە تۆقێنەرە! لەم هەتا هەتاییەوە کلۆڵی پەیدا دەبێ، هەمیشەکلۆڵی و سوکایەتی و رکوکینەیەک کە کۆتایی بۆ نییە.

**هەڵچوون و بڕیارەکان:**

١- خۆتان بە وشەکانی ئەشعیا[٨٢] پەروەردە بکەن:

-ئەی دەروونی من! دەکرێ بۆ هەتاهەتایە لەم ئاگرە هەمیشەییەدا بژیی و بەرگەی ئەم ئاگرە لەشخۆرە بگریت؟ دەتەوێ بۆ هەمیشە دەستبەرداری خوداکەت ببیت؟

٢- دان بەوەدا بنێن کە ئێوە شایانی ئەوەن، بەڵام چەند جار؟ دەمەوێ لە ئێستا بەدواوە بەرێگەیەکی جیاوازدا بڕۆم، بۆچی بکەومە نێو ئەم کەندەڵانەوە.

٣- هەڵدەستم بەو کۆششە یان بەویتر تا لە گوناهەکان دووربکەومەوە کە بە تەنیا ئەوانە دەبنە هۆی ئەم مردنە ئەبەدییە.

"سوپاسی خوداتان بکەن، قوربانیی بۆ بدەن، نوێژی بۆ دابەستن".

خاتوو تریز داڤێلا دوایەمین گێڕەرەوەی دۆزەخ بووە، ئەم ئافرەتە زیاد لە رادە هەستیار بووە، تەژی بووە لە سۆزێ کە تا ئێستاش کەسایەتییەکەی جێی سەرسووڕمان و چەواشەکردنی مێژوونووسانە، ئەمە لە ساڵی ١٥٦٠دا وەک ئەزموونێکی دەروونی بەدەست دۆزەخەوە ناڵاندوویەتی، ئەو دەڵێ خودا ئەو چارەنووسەی نیشانداوە کە شایانی هەڵەکانیەتی، گەر بێتو خۆی لێیان دەرباز نەکا. خەیاڵەکانی یەکێکن لە شاکارەکانی ئەدەبی دۆزەخیی، کە ترسێکی رەها بەسەریدا زاڵە. لێرەدا

---

٨٢: یەکێکە لە پێغەمبەرەکان و لە ساڵی ٧٤٠ی پێش زاییندا دەستی بە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی کردووە و هەتا ساڵی ٧٠٠ی پێش زایین بەردەوام بووە، لە قودسدا ژیاوە و لەو پێغەمبەرانەش بووە کە باسی لە هاتنی حەزرەتی عیسا کردووە.

دۆزەخ دیمەنێ نییە، بەڵکو راستییەکی دەروونی زیندووە لەنێو دەروونەدا، زمانی مرۆڤ دەستەوسانە لە گوزارشتکردن لە توندوتیژییەکەی کە لە رادە بەدەرە، (مـن) بـۆ سـاتەوەختێکی نەمـر لە چـاوەڕوانی خنکـانێکی تەواودا نغرۆ دەبێ کە هەرگیز نایەت:

دەروازەی دۆزەخ وەک یەکـێ لە شـەقامە درێـژ و تەسـک و داخراوەکانی یەکێ لەلایەکانی دەهاتە پێشچاوم، هەروەک کونی گڕکان زۆر نزم و گەلێ تەسک و فرە تاریک. وا هـاتە بەر دیدەم زەویەکەی لە قوڕی پیس پێکهاتووە، بۆنی لە رادە بەدەر سیخناخە بە مـاری ژاراوی، لە کۆتـایی ئەم شـەقامە بچـووکەدا، خـۆمم بە یەخسـیری لە کـونێکی هەڵکـۆڵراودا بینیـیەوە، کە لە دیوارێکـدا بـوو لەسـەر شـێوەی چـرایەک، کـونەکەم لـێ تەسـک دەبێـتەوە. هەرچەنـدە ئەوەی باسـمکـرد زۆر لەوە نـاهەموارترە کە دەیگێڕمەوە، بەڵام هێشـتا خـۆش و شـیرینە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی لەنێو ئەمجۆرە چرایەدا چەشتوومە.

ئەم ئازارە گەلێ ترسـناک بـوو، بەرادەیەک ئەوەی دەشـێ لەبارەیەوە بیڵێـین، تەنیـا بەشـێکی زۆر بچـووکیەتی. هەسـتمدەکـرد دەروونـم بە ئـاگرێکی یەکجـار گەورە دەسـووتێ، مەحـاڵە بەو شـێوەیەی بینیـومە وەسـفی بـکەم، چـونکە نـاتوانم دەرکـی پـێبـکەم، هەوڵـمدا بە شـاهێدی پزیشـکەکان، قورسـترین ئـازارێ کە بکـرێ مـرۆڤ لەم ژیـانەدا بەرگەی بگـرێ، ئـازاری کـۆڵنجی دەمارەکـانە، ئازارەکـانی دیکـەیە کە ئیبلیسـەکان تووشیان کردم، بەڵام ئەم ئازارانە هـیچ نین گەر بەراوردی بکەم لەگەڵ ئەوەی کە لەو سـاتانە چەشـتم، ئەمە بێجگە لەو تـۆقینەی تووشـم هـات، وەختێ بینیم کە چ ئەشکەنجەدانێ لەئارادایە. تەواوی ئەمـانە هـیچ نـین لە بەرانـبەر ئەو دڵتونـدییەی دەروونـی تێـدایە، وا دەهـاتە پێشـچاو کە هەناسـەکان لەسـەر جەسـتە تەنـگ دەبـن، دەخنکـێ، ئـێش و کڵـۆڵییەکەی

دەگـاتە ئاسـتێ، بێهـودە هەوڵـمدەدا بیگێـڕمەوە. هەرچـی بگـوترێ کەمە لەبارەی ئەوەوە کە بەردەوام ئازار پارچە پارچەی دەکا، چونکە ئەوەی دەیهـاڕێ تونـدوتیژییەکی سـەیرە، دەشـێ ژیـانی لـێوەرگـرێتەوە، لەبـری ئەوەی بەخۆی دەری بێنێ و پارچە پارچەی بکا. بەڵام ئەم ئاگرە و ئەم کڵۆڵییە، کە جامی ئازارێکی تۆقێنەری لێوانلێو کردبوو، دانی پێدا دەنێم کە لە باسـکردنیدا حەقـی خـۆیم نەداوەتـێ. ئاگـادار نەبـووم کـێ ئەم سـەختییەی خسـتە ڕێم، بەڵام هەستمدەکرد کە دەسـووتێم، بۆ هەزاران بەش پارچە پارچە دەبم، ئەمە پێدەچێ بۆ من قورسـترین ئازار بـووە کە چەشتوومە.

لە شوێنێکی ترسـناکی ئاوهـادا، چ ئومێدێکم نەبوو بۆ سـەبوورییەک، شـوێنێ نەبـوو تەنیـا بـۆ دانیشـتن یـان بەشـی خەوتنـێ، وەک کـونێکی هەڵکـۆڵراو بـووم لە دیـوارێ، ئەم دیـوارە ترسـناکانەش بە پـێچەوانەی سیسـتەمی سروشـتەوەن، گەمـارۆت دەدا و لە پەلوپـۆت دەخـا. هەمـوو شتێ لەم شوێنەدا خنکێنەرە، تاریکییەکی ئەنگوستەچاوی کەوتوو بەسەر یەکدا، چ ترووسـکاییەک ڕۆشـنایی تێکەڵـی نـابێ، تـێناگەم چۆن دەکرێ ئەمە ڕووبـدات، سـەرەڕای ئەوەی هـیچ ڕۆشـناییەک نیـیە، دەتـوانین ئەو شتانە ببینین کە بەر دیدەمان دەکەوێ".

# بەشی هەشتەم

## دۆزەخی سەدەکانی حەڤدە بۆ نۆزدە لەنێوان هەڵکشان و داکشاندا

لە چارەکی یەکەمی سەدەی حەڤدەدا، ریفۆڕمی تریدنتینی[٨٣] کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە، شۆڕشێکی کولتوریی راستەقینە بوو، رووخسارێکی نوێی تا رادەیەک یەکلاکارانەی بەخشیە کڵێسا، تا ئەو کاتەی سەرلەنوێ ناکۆکی لە سەدەی نۆزدەدا باڵی بەسەردا کێشایەوە. ئەم چاکسازییە چاوپێداخشاندەوەیەک بوو لە سەرلەبەری کولتوری رۆژاوا، پاش ئاژاوەکەی سەردەمی ناوەڕاست و رێنیسانس. بەوردی بیروباوەڕەکان دەستنیشانکران و رێکخران، سیستەمی کڵێسایی لە پێکهاتەیەکی سەراپاگیردا جێ پێی خۆی قایمکرد، بەو جۆرەی وەلامدەرەوەی ئەو قۆناغە بێ، کە دەکەوێتە نێوان سالانی ١٦٠٠ و ١٦٥٠. کارەکە مەزن بوو، بەلام خاڵی لاوازی سەرەکیی لەوەدابوو کە خۆی لەهەموو گۆڕانکارییەکی ئایندە بێبەش کردبوو. لە کۆتایی سەدەی حەڤدە وا روویدا کە دوورکەوتنەوەیەک لە بیرکردنەوەدا بێتەئاراوە، لەگەڵ گۆڕانی کولتوریشدا زیادی دەکرد، کە هۆکار بوون بۆ رەتکردنەوەی بیروباوەڕە تراديسیۆنییەکان.

چەمکی دۆزەخ وێنەیەکی تەواوی ئەم دوورکەوتنەوەیەی هەبوو، بڕوا(ئیمان) بەهۆی دۆزەخەوە کامڵ بوو، کە بەوردی و گیانێکی

---

٨٣ : کۆڕبەندێک بووە لە سالانی(١٥٤٥ بۆ ١٥٦٣) لە شاری ترانتۆی ئیتالیا بەستراوە و بایەخی بە رێکخستنی کڵێسای کاتۆلیکی داوە، هەروەها نوێکردنەوەی بیروبۆچوونەکان پاش ریفۆرمەکانی پرۆتستانتی.

ترادیسیۆنانەوە پشێوی و ئاژاوەگێڕییەکانی سەدەی چواردەی ڕێک- خست و درێژ بۆوە بۆ سەدەی شازدە، لەچوارچێوەی تێڕوانینێکی دەستەبژێرانەی دیاریکراودا، دیکترینی سەراپاگیر بەهەماهەنگیی لەگەڵ شارستانییەتی سەدەی مەزندا(سەدەی حەڤدە لە فەرەنسا) کامڵ بوو، ئاسمانی بۆ ژمارەیەکی کەم لە هەڵبژێردراوەکان کردە ماڵ. لە سەدەی نۆزدە، سەدەی جەنگەکان کە هەڵوێستەکان بەهۆیەوە سەرسەخت تر بوو، بێزاری و ناڕەزایەتی زیاتر بوو. بەڵام لە ساڵانی ١٦٨٠- ١٧٢٠ لەمیانی( قەیرانی ویژدانی ئەوروپی) بیرۆکەی دۆزەخ کەوتەوە ژێر گومان و گەنگەشەکردنەوە، بەتایبەت لە پڕەنسیپە سەرەکییەکەیدا، واتە نەمری. فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدە و کریستیانە لیبراڵەکان لە سەدەی نۆزدە، وێکنەهاتنەوەی نێوان خۆشەویستیی خودا و ئازاری بێکۆتاییان سەلماند. لەکاتێکدا کڵێسا لەسەر هەڵوێستی خۆی سوور بوو. وردە وردە ترس لە زەینی باوەڕدارانـدا پاشەکشەی کرد و دۆزەخی جیهانەکەیتر گۆڕا بۆ ئیمانێکی بە بەردبوو، لە سەدەی بیست- دا شوێنەکەی چۆڵ بوو بۆ دۆزەخی زەمینی و مرۆییەکی تەواو.

**١- دۆزەخی ترادیسیۆنی:**

دۆزەخ بە کرۆکی پڕۆسەی دووبارە ڕێکخستنەوەی ئیمانی و سەرپەرستییەوە لکێنرا وەک دەزگایەکی سەرەکی لە هێڵکاری رزگاربووندا، بەمەبەستی چاکسازیی کاتۆلیکی. وەک چۆن دۆزەخ ڕۆڵی سەرپەرستیی بوو، لەهەمان کاتیشدا مژدەدەری ڕۆژی دواییش بوو. ئەم ڕۆڵە ترسی رزگاربوونی لە دەروونی کریستیانەکاندا زیندووکردەوە، بۆ ئامانجی دوورکەوتنەوەیان لە خەتاکاری و خستنە رووی دواچارەسەر بۆ سەرلەبەری بێباوەڕان و بتپەرستان و یاخیبووان و سەرسەختە نکۆڵیکارەکان کە بەخشندەیی خودایی ڕەتدەکەنەوە.

ڕێنماییەکـانی مەسـیحییەت بە شـێوەیەکی ڕوون، بـڕوای لە زەینـی باوەڕدارانـدا بە تێرمێکـی ورد و یەکلاکـارانە دەچەسـپاند. بـۆ نمـوونە ڕێنماییەکـانی بـورج لە چـاپی ١٧٣٦دا زیـاد لە(١٠) لاپەڕەی بـۆ دۆزەخ و ڕۆژی دوایی تەرخان کردبوو. ئەمەش یەکێکە لە کۆپلە سەرەکییەکانی:

پ- دۆزەخ چییە؟

و- ئەو شوێنەیە کە مردووی بۆ ڕەوانە دەکرێ، لە دۆخێکیشـدا گەر گوناهێکی کوشندەی کردبێت.

پ- چەندێ گوناهی پێویستە تا بکەویە نێوییەوە؟

و- یەک خەتـا گەر خەتاکـار بە شـێوەیەکی ڕاسـت و درووسـت لێـی پەشـیمان نەبێـتەوە، هەر ئەوەنـدە بەسـە بـۆ ئەوەی تاهەتـایە خـۆی بدۆڕێنێ.

پ- گوناهکار چەندێ لە ئەشکەنجەی دۆزەخ ڕەنج دەکێشێ؟

و- ئەشـکەنجەدانەکەی بریتـی دەبـێ لە ئـازاردانی هەسـتەکانی و ئەشکەنجەی دۆزەخ و ئازاری هەتاهەتایی.

پ-بەپێی پەڕاوی پیرۆز لەبارەی ئەم ئەشـکەنجەدانە، دەبێ سـەرنجی چی بدرێت؟

و- ١: شوێن کە زیندانێکی ترسناکە، زینـدانێ تـۆقێنەرە لەنـاوجەرگەی زەوی هەڵکۆڵراوە. ٢: زنجیرەکان کە دەکرێنە دەست و پێی تیاچووەکـان، هەموو ئومێدێ بۆ هەڵاتن و بەرگری لەخۆکردنیان لـێ زەوت دەکـرێ. ٣: کـۆمەڵ، کـۆمەڵی تیاچووەکـان کە بـریتییە لە سـەرجەم گوناهبـارانی ئەم سەرزەوییە و هەموو دزەکان و هەر خراپەکارییەک کە لە خەڵکدا هەبێ و قێزەونترینیان، بێباوەڕەکان و زەندیقەکان، بکوژەکان، جادووگەرەکـان و ..هتد...بوغزاوییەکان، نەفرەتییەکان، قیناوییەکـان. ٤:خـودانی ئەم شـوێنە کڵـۆڵە لۆسـیفۆرس و دەسـت و پێوەنـدەکانیەتی، واتە گیـانە بێـزارە

شەڕەنگێزەکان، ناشیرین، قێزەون، فێڵباز، هار، ستەمکار کە رقێکی تاڵی کوشندە بۆ رەگەزی مرۆڤ ئامادە دەکا. ٥: ئازارچەشتنی هەموو هەستەکان و سەرجەم تواناکان: لەوێ تاریکییەکی چڕ پەردە بەسەر چاوەکاندا دەکێشێ، هەرگیز رۆشنایی نابینێ، لەوێ فرمێسک و نرکە و ناڵە و چۆقەی ددانەکان و گریان و حەسرەت و ئاخ و داخ هەڵڕشتنە، لەوێ گیسکە دۆزەخییەکان لە چەقی ئەم جیهانەوە بۆگەنییەکی لەرادەبەدەر دەخەنەوە، لەم ئاودەستە گەردوونییەوە بۆنی گۆگردێکی هاتوو لەدۆزەخی بۆ زیاد دەکرێ، لەوێ گوێیەکان بە هاوار و نەفرەت-کردن و جنێودان و بۆڵە بۆڵا و قسەڵۆک پڕدەبن، لەوێ برسێتییەکی هار و تینوێتییەکی بەتین ئۆقرە بەشوێنی ئەو هەژارانە هەڵدەگرێ، کرمەکانیان بە بەردەوامی دڵیان دەقرتێنن، بەڵام لەم زۆنگاوە گڕگرتووە بە ئاور و گۆگرد کە سزادراوەکانی تێدا نغرۆ دەبێ و بۆ هەمیشە دەسووتێن، چی بڵێین؟ ئەوە نموونەیەک بوو لە دۆزەخ".

دوای ئەوە رێنمایی کریستیانی، سروشتی ئازارەکانی دۆزەخ و هەستە ئەبەدییەکان لە سروشتی گوناهەکان جودا دەکاتەوە، کە دەبنە هۆی ئەم قیامەتە نەگبەتە. سەرجەمی ئەو رێنماییانە روون و لۆژیکین، دیکارتین، بە وشەیەک گوزارشتی لێبکرێ: کلاسیکییە. دۆزەخ تا رادەیەک پێویستە و ماتماتیکیشە: ئایا بۆسیێ لە ساڵی ١٦٨٧ بیردۆزێکی ماتماتیکی دانەنا و ئەنجامەکانی بە ئاسایی لەسەر ئەوە چڕبوونەوە کە(خودا ناتوانێ خۆی لە سزای هەتاهەتایی یاخود بە لانیکەمەوە بەپێی ئەوەی تاوانبار دەتوانێ بەرگەی ئەشکەنجە بگرێ، لە سزادانی گوناهباران لابدات یان چاوپۆشی بکا).

وتاربێژەکان بەپێی رێسایەکی دیاریکراو و نموونەگەلێ کە کتێبی تایبەت بۆی تەرخانکردوون، دۆزەخ بە بەشێکی تەواو لە وتار و

ئامۆژگارییەکانیـــان دادەنـــێن، بـــۆ نمـــوونە لە ســـەرەتای ســـەدەی هەژدە(کتێبخـــانەی وتـــاربێژ) کە خـــاوەنەکەی ڤنســـان هـــودرییە، (١٠٣) لاپەڕەی بۆ بابەتی(دۆزەخ) تەرخان دەکا و نووسـەر ئاماژە بۆ هەموو رەوانبێژییەک دەکا، کە بەهـۆیەوە بشـێت مەسـەلەی ئـازار و ئەشـکەنجە بـورووژێنێ. نووسـەر داوا دەکا کە بەردەوام ئاماژە بە گرنگی سیفەتی بێ چەندوچوونی دۆزەخ بدرێ، وەک تاکە ئەنجامێک بۆ خۆشەویستی و دادوەریی خودا. دۆزەخ " تا ئەوپەڕی رەوایە".

ڤنسان هۆدری پەیکەرێکی نایاب و نموونەیەک لە لێکۆڵینەوەگەلێکی کلاسیکی دەخاتەڕوو، کە سێ سێ بەشی کردوون، چەندین ئامۆژگاریی دۆمینیکی بە سەدان نموونەوە لێ درووستکردووە:

- دەروازە: ها ئەوە من گۆیارەکەم لەسەر شتێکی ترسناک.

- بەشی یەکەم: ئەشکەنجەی دۆزەخ.

١) گرنگی چاکەی بزربوو، زیادی دەکا.

٢) ئارەزووی بەتین بۆ پەیوەستبوون بەخودا، گەورەتری دەکا.

٣) بیرکـردنەوە لە بـێپەروایـی شـتەکان کە لە پێناویانـدا ئەم کـارە باشانە بەهەدەر چوون، تۆقینەکانی مەزنتر دەکا.

- بەشـی دووەم: ئـازاری هەسـتەکان کە لەدەوری ئەم ئـاگرە یەکجـار زەبەلاحە چەقیان بەستووە.

١) کاریگەری ئەم ئاگرە لە دەروون و جەستە.

٢) لەنێویدا هەموو ئەشکەنجانەی دەشێ ئەنجام بدرێن، یەکدەگرن.

٣) بەهۆی بڵاوبوونەوە فراوانەکەی، ئێشێکی گەورە دەخاتەوە.

- بەشی سێیەم: هەمیشەیی ئەم دوو جۆرە ئەشکەنجەیە.

١) هەتاهەتاییەکی دادوەرانەیە.

٢) بیرکـردنەوە لەو هەتاهەتـاییە وادەکـا، ئـازارەکە نەتـوانرێ بەرگە بگیرێ.

٣) سـەیر و سـەمەرەیی خەڵـک کە کـوێرن و مکـووڕ دەبـن لەسـەر ئەنجامدانی گوناهکاری.

-پوختە: گۆڕینی بەپەلەی ڕێرەوی ژیان.

ئامۆچیـاری ئاسـایی بـایەخێ زۆر بە ڕووی سـەرکوتکارانەی ئـایین دەدا. ئامارەکانی پشـتبەسـتوو بە سـەد دانەر لەنێو کۆمەڵێ مژدەدەری کریستیانی کە باوە مینێ لە سەدەی نۆزدەدا بڵاویکردۆتەوە، هەروەهـا بەپێـی ژان دولۆمـۆ-ش، ڕێـژەی ئەو بەشـانەی قسـە لەسـەر (گونـاهە و ئازارچەشتن) دەکەن، لەنێوان(٦١ بۆ ٨٤%) پێکدێنن. ئەمانە هەوڵدەدەن ئـازار و ئەشـکەنجەی ئەو تیـاچووانە زەق بکەنەوە، کە بەخشـینیان نیـیە، چەنـدین وێـنە و لێکچـوون خـڕدەکەنەوە و خۆیـان لە ئابڕوومەنـدی و ڕێکوپێکی ناپارێزن، بۆ ئەوەی واقیعی بن، دەست دەخەنە سـەر هەمـوو شتێ. ها ئەوەتانێ کۆپلەیەکی وەرگیراو لە دەیان هەزار لاپەڕەی ئەدەبی دۆزەخـی، کە بـریتییە لە ئامۆژگـاری کـاهینێکی یەسـوعی بەنـاوی پیـار کۆتـــۆن(١٥٦٤-١٦٢٦) لە ســـاڵی ١٦١٦ لەســـــەر بــــابەتی(دۆزەخ و ئەشـکەنجەکانی) داویەتـی، دوای قسـەیەکی زۆر لەسـەر ڕۆژی دوایـی و ڕێگەی چوونە دەرەوەی، تیاچووەکان کە بزنی بۆن پیسـن و جەستەیان شـێواو و تـۆقێنەر و بـۆگەنن، دەخزێنـرێنە شانشـینی شـەیتانەوە بە قووڵایی ١٧٦٠ فرسـەخ لە ژێـر زەوییەوە، ئەمە وەسـفی شـوێنەکەیە: ١- دۆزەخ زینـدانی هەتاهەتـاییە پڕ لە ئـاگر و ئەشـکەنجەی تـۆقێنەرە کە لە هەژماردن نایەت، بۆ سزادانی هەمیشەیی ئەوانەیە گوناهێکی کوشندەیان کردووە. ٢- دۆزەخ جێیەکە لە ژێر زەوی، تاریک و نووتەک لە ناوەندی جیهانـدایە، هەرگیـز تیشـکی خـۆر و ڕۆشـنایی مانـگ و هەسـارەکانی بـۆ

ناچێت، ئەوی هەیە تەنیا ئاگرە، هەرچەندە سووتێنەرە، بەڵام رووناکی نادات. ٣- دۆزەخ هەناوە(ریخۆڵەکانە) زۆر تەسکە و بەدەوری ناوکدا پێچی خواردووە، بەرادەیەک هێندەی گۆڕێک شوێن نەماوە بۆ جەستەی تیاچووەکان، لەسەر یەک کەڵەکەبوون وەک خشتەکانی نێو کوورەی دروستکردنی گەچ هەریەکەیان بەوی‌تریانەوە نووساوە. ٤- دۆزەخ بەپێی ساینت یۆحەننا، دەریاچەیەکە لە ئاگر و گۆگرد، گەرماییەکی زۆر بۆ ئەشکەنجەدان ئامادەکراوە، چ ئومێدێ بۆ ساردبوونەوەی نییە، لێرە چۆقەی ددانەکان دێ وەک پەڕاوەکە باسی‌دەکا. ٥- دۆزەخ شوێنێکە تەژی بەهەمموو جۆرە پیسییەک، کە لە زێرابی ماڵەکان و ئاودەستی کەشتییەکان و زبڵ و پاشەڕۆی گوندەکانەوە دێ. ٦- دۆزەخ گۆڕستانی جەستەکانە، کە فریشتەکان لە یەکەمین تاوانبار و بکوژی براکەیەوە هەتا جەجاڵ و شوێنکەوتوانی، دەراوێشتەی لاشەکانی مرۆڤی تێدا فڕێ دەدەن. ٧- دۆزەخ ئەشکەوتێکی گەنیوە، ئارەقەی جەستەی تیاچووە زیندووەکانی تێدا دەڕژێ، لە لاشە پیسەکانیانەوە ئارەقەیەکی گەنیوی لەڕادەبەدەر ناخۆش دێ. ٨- دۆزەخ کۆڵێتێکی تووڕەییە، قەفەسی شێتەکانە، شارۆی گەمژەکانە. ٩- دۆزەخ چاڵێکە لەهەموو لایەکەوە بە قفڵ و شیشی ئاسن و پلەپلە و زنجیری هەمیشەیی داخراوە، لە سەریشیەوە تووڕەیی خودا کۆتاییەکەیەتی. ١٠- ترتلیانۆس لە بەرانبەر ئەوانەی دەیانەوێ هەرچییەک لەبارەی دۆزەخەوە بگوترێ، بڵێن ئەوانە هەواڵگەلێکی مەجازییە، بەبێزارییەوە دەڵێت: دۆزەخ ئاگرێکی ژێرزەویی شاراوەیە، بۆ سزادان ئامادە کراوە... لەنێو ئەوانەدا کڵڤان-ی کڵۆڵ و ئەوەشی دەیڵێت لەبارەی پێشبینییەکەی ئەشعیا کە لە بەشی سیەمیندا هاتووە و باسی تۆفێت[٨٤] دەکا. ١١- دۆزەخ دۆخێکی هەمیشەییە، لەوێ

٨٤ : بەپێی لێکدانەوەی ئینجیل لە شوێنێکی دۆڵی بن هنوم، منداڵیان دەکردە قوربانی بۆ

دوژمنانی خودا لە چاکە بێبەش دەکرێن، کە تامەزرۆی دەبن و ئازاری دەچێژن کە لێی دەترسان. ١٢- دۆزەخ کەلەسێکە[٨٥] لە ئەشکەنجەیەکی مەزن، تەنانەت سەرلەبەری ئەو ئێش و ئازارانەی لە پێوەدانی دووپشکەکان و خلۆکەکانی ئەشکەنجە و سەکۆکەکانی ئازاردان و دەمە تیژە گەورەکان و برژێنەرەکان و گای پۆلایی و بەرداش و گورون و دەرهێنانی ئەندامەکانی جەستە و تێلاتێبڕین و کلاوی ئاگریی و بەشیشداکردن و هەموو جۆرە ژانەسک و کۆڵنج و تەنگاوییەک و مێشک گووشین و چەندین نەخۆشیی دیکە، هەرچەندێ بەسوێ و سووتێنەر و هەستیاربن، لەچاو ئازار و ئەشکەنجەی دۆزەخدا، وەک کەوتنە خوارەوەی دڵۆپە ئاوێکە".

دواتر جۆرەها ئەشکەنجە هەژمار دەکا، باوە کۆتۆن بەدرێژایی لاپەڕەکان هەموو ئازار و نەهامەتییەکان وەڕوو دەخا، ئەوەندەی کە توانیبێتی کۆی بکاتەوە، هەر جەستەی کەرت و پەرتکراو و کونکراو و هاڕاو و کولاو لەسەر ئاگر، برژاو، پەستێنراو لە قوتوی گەرمکراوەدا، مەمک و ئەندامێن زاوزێی بڕاو و کونکونکراون: لەزۆر لاپەڕەی تردا شێوازەکانی کاری ئاگر باس دەکا و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، ئەمانە هەمووی رەمزیی نیین وەک ئەوەی کلڤانی (بێباوەڕی کلۆڵ) بیری لێدەکاتەوە، دواجار پاشئەوەی گوێگر بە نمایشی گۆشت و خوێن و ئاگر سەرسام و هیلاک دەبێ، بەو ژمارانە کە کەڵەکەبوونێکی نەزانانەیە بۆ ئەبەدیەت: لەوێ دەیان ساڵ تێدەپەڕێ، بیستەها و سەدان

---

خواوەندی مۆلەک، ئەمەش پێیگوتراوە مۆفیت کە ماناکەی شوێنێک دەدات شتی تێدا بسووتێنرێت یان سوتماک.

٨٥ : کەڵەکەبوو، تۆپەڵ، رکام(بەزمانی عەرەبی).

و هەزار و دەیان هەزار و ملیۆنەها و سەدان ملیۆن و ملیۆن ملیۆن و ملیارەها ملیار دەگوزەرێن، بەڵام ئەشکەنجەکان دووبارە دەبنەوە و ناگۆڕێن".

لەدەرباری پادشایاندا کە لەویش وا پێویست دەکا قسە لەسەر دۆزەخ بکرێ، بۆ شازادە وێنەیەکی نەرمتر و نیانتر نمایش دەکرێ. بۆردالۆ لە ئامۆژگارییەکانی لەهەمبەر دۆزەخ" گوێگرە خۆشەویستەکان"ی دڵنیا دەکاتەوە، کە میللەتی سەرەتایی پێویستی بەم وێنە بازاڕییانە هەیە، بەڵام دۆزەخی ئامادەکراوی ئەرستۆکراتەکان زیاتر رێکوپێکە، هەموو چینێک لە خەڵک دۆزەخی خۆی هەیە: " ئەم راستییە لە ژێر فۆڕمی هەستیدا پیشانی میللەت دەدرێ: زۆنگاوێ لە ئاگر، هەڵدێری گڕاوی، تارمایی تۆقێنەر، چیرە چیرِی ددان، بەڵام ئێوە ئەی گوێگرە ئازیزەکان، گەر لەم جیهانەن و لە گۆشت و خوێنن، ئێوە بە مانایەکیتر رۆحانین، ئێوە کەسە ژیرەکانی ئەم دنیایەن و ئەم راستییە بە شێوە سادەییەکەی باوەڕ بەسەرتاندا دەسەپێ، بە رادەیەک تێگەیشتنێکی وردی لەبارەوە وەردەگرن، کە بەسە بۆ ئەوەی بتانخاتە سەر رێی راست".

میشاڵ هۆلان لە(ڕووخساری شاراوەی زەمەن) و (گۆڕانکارییەکانی جیهانەکەیتر)زۆر بە روونی مانای ورد و قووڵی ئەم ئامۆژگارییانە دەسەلمێنێ، کە ئامانجی بەخشینی وێنەیەکی بێگەردە لەسەر ئەشکەنجەدان، ئازاری ناوەوە و دەرەوە پێکەوە، ژینگەیەکی فشارهێنەری لەرێگەی کۆکردنەوە و تەسکیی شوێنەوە پێکهێناوە، کە بواری حەوانەوەی تێدا نییە، جێی کاتبردنەسەر و پشوو نییە، لەگەڵ دەرککردنێکی بەردەوام بە هەتا هەتایی بوونی ئەم شوێنە. دۆزەخی کریستیانی کاملترین سیستەمی هەمەلایەنەی ئەشکەنجەدانە، کە عەقڵی مرۆڤ وێنای کردبێ، ئەوێ جیهانێ داخراوە لە شەڕەنگێزییەکی رەها،

ئەمەش پێچەوانەیەکی لۆژیکییە بۆ ئایینێک کە هەڵگری خۆشەویستییەکی ڕەهایە.

پرۆتستانتیی لە سەدەی هەژدەدا نموونەیەکی هاوشێوە لە وتاری ئەنگلیکانییەکان و پاکڕاگرەکان پێشکەش دەکا، لە نموونەگەلی جەی .دۆن و ئاڕ. پاکستەر، ئی.کالامی، تی.گۆدوین، دەبلیو. پرکنز. قەشە جۆن بونیان خەیاڵەکانی دۆزەخ دەستبەرداری نابن، لە ساڵی ١٦٥٨دا لەمیانی کتێبی(هەندێ دیمەن لە دۆزەخ) ئەشکەنجەدانەکانی نمایش دەکا، ئەم کتێبە لە هەردوو سەدەی حەڤدە و هەژدە سی و پێنج جار لەچاپ دراوەتەوە، لەکاتێکدا جۆن میڵتۆن سەرقاڵ بوو بەدانانی داستانە دۆزەخییە ڕەمزییە زەبەللاحەکەیەوە(بەهەشتی بزربوو).

ئایا دەکرێ جیاکاری نێوان دۆزەخی شێواز کلاسیکی و دۆزەخی شێواز بارۆکی[٨٦] بکەین؟ دابەشکاری لەمبوارەدا لەگەڵ ئەو دابەشکردنە نایەتەوە، کە بەشێوەیەکی گشتی لە هەردوو کایەی هونەری و ڕۆشنبیری، بەرەو ڕوومان دەبێتەوە، دژبەیەکە ترسناکەکە لەهەردوو سەدەی حەڤدە و هەژدە، لەنێوان دۆزەخی هەستیی و دۆزەخی عەقڵیی جێ پێی خۆی قایم دەکا.

یەکەمیان بۆ چینی خوارەوە، بۆ میللەت کە ئامۆچیاران بەپێی پێداویستیی و دۆخی جۆراوجۆر، زۆرزانانە قسەی لەسەر دەکەن. کۆمەڵەی ئێن.جیرار لەسەدەی هەژدەدا داینا و ناونیشانەکەی( ئامۆژگاریگەلێ کورت یان ڕێنماییە باوەکانی تایبەت بە خەڵکی

٨٦: بارۆکی زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی بزاڤێکی ڕۆشنبیری بەکاردێت، کە سەردەمەکەی لە کۆتایی سەدەی شازدەوە دەست پێدەکات و کۆتاییەکەشی نیوەی سەدەی هەژدەیە، تایبەتمەندییەکەی لەوەدایە کە جووڵەیەکی زیاتر و ڕوونتر لەخۆی نیشان دەدا و ئاوێتەیەکە لە هونەری کلاسیکی و سەردەمی ڕێنیسانس بەڵام بە شێوازێکی نوێ. ئەم زاراوەیە بەکارهێنانە پراکتیکییەکەی لە ساڵی ١٦٠٠ لە ڕۆما سەری هەڵدا.

گوندەکان)، ئەمە بۆ ئەوە بوو کە بیرۆکەیەکی باشی پشت ئەستوور بخاتەڕوو لەسەر گشت تۆمارکراوەکانی پەیوەست بە ئاسەواری ئاگر، وێنەی تیاچووەکانی نێو کوورە پیشان بدات" زمانیان دەبێتە شیشێکی سوورۆکراوە وەک پشکۆ، لێویان دەبێتە لەوحێکی سوتاوی مس، مەلاشوویان کوورەیەکی گڕگرتووە، ددانیان پارچەیەکە لە ئاسنی تواوە، سیەکانیان باوەشێنی ئاگرە، سک و گەدەیان، بۆتەیەکە سەختترین کانزای تێدا دەتوێتەوە".

لەهەمان سەردەمدا نامیلکەیەکی میللی بەناونیشانێکی سەرنجڕاکێش دەرکەوت(باش بیری لێبکەرەوە) یان بیرکردنەوە لەهەمبەر چوار کۆتاییەکەی دوایی، کە دەخرێتە سەر ئاگری ئەژدیها و مارەکان، کۆشش دەکا بۆ سەلماندنی ئەوەی هەر پێنج هەستەکە پەیوەستدارن بە ئەشکەنجەدانەوە: " پاش رۆژی دوایی هەریەکە لە پێنج هەستەکە ئەشکەنجەدانێ تایبەت بەخۆیان هەیە، هەستی دەستلێدان بەتینەوە هەست بە گڕی دڕندە دەکا، هەستی بینین شتی ترسناک وەڕوو دەخا وەک هەژدیها و تارماییگەلێکی تۆقێنەر، هەستی چەشتن بەردەوام بەدەست تاڵی و زوخاوەوە دەناڵێنێ، هەستی بۆنکردن بۆگەنی ناخۆش هەڵدەمژێ، گوێیەکان جنێو و هاوار و پرتە و بۆڵەی تیاچووەکان و قاقای گاڵتەجاڕانەی ئیبلیسەکان لە کریستانییەکان دەبیستێ، کە دەرفەت و رێگەی جۆراوجۆریان بۆ رەخسابوو، دەروونی خۆیان رزگاربکەن، بەلام نەیانکرد".

ئەم دیمەنانە کە نێردەکانی ناوەوە دەیگوازنەوە، وایدەکرد دانیشتووانی گوندەکان لەترسان بلەرزن. یەکێ لە گەورەترین پسپۆڕەکانی ئەمبوارە، باوە جولیان مۆنوارە، لەنێوان سالانی ١٦٤٢ و ١٦٨٢دا لە هەرێمی بەریتانیای خواروو، لەمیانی ٣٧٥ شاندی ئایینیدا

ئامۆژگـاری پێشـکەش کـردووە، بەڵام پەنـای بـردۆتە بەر بەکارهێنـانی زۆرترین شێوازی پەروەردەیی و شۆڕشگێڕیی، وەک بەکارهێنانی تـابلۆ وێنەییەکان کە ڕێگەیەکی بەرینیان نیشان دەدا، دەشتێک بوو کە دەچۆوە سەر دۆزەخ. ئەو کاتانە تۆقاندن پاساوی سـەرەکی بوو، لەچوارچێوەی یەکـێ لە شـاندەکان بـۆ ئۆیسـۆن هەروەک خـۆی دەیگێـڕێتەوە: باسـی ئەشکەنجەدانەکانی دۆزەخ و ئەو گوناهانە دەکەین، کە خەڵکیـان گەیاندە ئەوێ. ئیدی خەڵک دەگریان و دەیانگوت" ئەفسوس تا ئێستا وەک ئـاژەڵ ژیـاوین، دواتـر ئەی خـودای چاکەکـار، چەنـدە قەرزاری ئەو بـاوانەین کە لەم دۆخە کەساسییە رزگاریان کردین".

ڤنسان دۆپۆڵی پیاوچاک زۆر بە بەزەیی نەبوو، لە( کۆمەڵە وتارێک لە نێردەگەلـی گونـدەکان)دا وای دەبینـین کە رۆژێ جیـا لە رۆژانـیتـر، دەسـتی بە هەڕەشـەدان کـرد، لە وتـارەکەی( ئەشـکەنجە جەسـتەییەکانی دۆزەخ)، وا پێدەچێ ئەو شوێنە هەروەک ئەوەی لەناوچەقی زەویـدا بێت، پیسـی و پـۆخڵی گـۆگرد و زفـت کە هەمـوو پیسـی گـۆی زەوی لەسـەر کەڵەکە بووە، سەرەڕای ئەو تاریک و نـوتەکییە" قێزەونییەکی تۆقێنەر لە جەستەی تیاچووەکان"و "خلۆکەی ئەشکەنجە و بەردی تواوە و مەنجەڵی زەبەللاح قوڵپ دەدا لەگەڵ ئەژدیها و مار" دەبینین، لەوێ خۆراکیان" بۆق و مـار و گۆشـتی گەنیـوە"؟ هـیچ بـواری بەزەیـی نیـیە، وەک نمـوونەی دەوڵەمەندە شەڕانیەکە کە ماوەی هەزار و شەش سەد سـاڵە دەپـاڕێتەوە بۆ دڵۆپێ ئـاو، خـودا وەڵامـی دەداتەوە" لەبیرت بێ تۆ لە ژیانتدا خێری خۆتت دەستکەوت، ئێستا پێویستە لەسـەر چاوچنۆکیت، بە برسییبوون و تینووبـوون سـزا بـدرێی و بتگـریەنن و هـاوار و نـاڵەی کڵـۆڵانەت بەرزبێـتەوە و ددانەکانـت چیـڕەی بێـت، بـێئەوەی لە خـوداوە بەزەییـت چنگکەوێ".

ئەکلیرۆسی رۆشنبیر لە سەدەی مەزندا(سەدەی حەڤدە) لەبارەی ئەم وێنە کاریگەرانەوە، لە قەشەی یەسوعی کراسێ لە ساڵی ١٦٨٠ دەپرسێ: کێ دەتوانێ بڵێ یاخود دەرک بەوە بکات، دۆزەخ چییە، کەمترین ئازار و نەهامەتییەک کە دۆزەخ لەخۆی دەگرێ، چییە؟ نیکۆلای قەشەی یانسینی[٨٧] گومان لە بوونی کرم و مارە دۆزەخییەکان دەکا.

وینڤەر بۆسۆیە لەبارەی قسەکردن لەسەر دۆزەخ، بە بەرجەستەبووی کلێسای کلاسیکی دادەنرێ، کەچی کلتورە زەبەللاحەکەی چ ئاماژەیەکی بۆ دۆزەخ نەکردووە، ئەو بێزار دەبێ لە دۆزەخەکانی بارۆکی میللی و دێت بۆ خۆی چەمکێکی رۆحانیتر سەبارەت بە دۆزەخی تیاچووەکان دادەرێژێ: " دەڵێم بەو پێیەی لەم یەکەیە جودان، ئەوە وایان لێدەکا لەسەر ئەم زەمینە دۆزەخێکی تایبەت بە خۆیان دەست پێبکەن، ئەوە گوناهەکانیانە فرێیاندەداتە هەڵدێرەکانەوە. وا بە خەیاڵتاندا نەیەت دۆزەخ لەسەر ئەم ئەشکەنجەدانە ترسناکانە، لەنێو زۆنگاوێکی ئاگر و گۆگردا، لەم گرە درندەیەدا، لەم بێزارییە، لەم کلۆڵییە، لەم چیرە چیرە تۆقێنەرەی ددانەکاندا، بەرپا دەبێ، نا هەرگیز دۆزەخ لەسەر ئەوانە هەڵناسێ. دۆزەخ گەر دەرکی پێبکەین، بەخۆی گوناهەکانە، دۆزەخ دوورکەوتنەوەیە لە خودا، بەڵگەش لەسەر ئەمە لە کتێبەکاندا بەڕوونی هاتووە". ئەم بیرۆکەیە لە وتاری ئامۆژگاریی(نەمری خودا لە تۆبەی گوناهباران)دا هاتووە و بەدواشیدا تێبینییەکی بەپێز دێت کە دەڵێ" ئەو کاتەی لە گوناهێکدا دەژیین،

٨٧ : تایفەیەکی کریستیانی توندڕەو و رەشبین بوون، نەیتوانیوە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەمی خۆی بڕوات، بۆیە لەلایەن فەرمانڕەوایی پادشاییەوە لە قۆناغی لویسی سیازدە و لویسی چواردە راونراون، ئەم تایفەیە مەترانێکی بەلژیکی بەڕێوەی دەبرد بەناوی جانسینیۆس(١٥٨٥-١٦٣٨) کە رێنماییەکانی لە هزرەکانی ساینت ئۆگستینەوە وەرگرتبوو.

بەخۆمـــان دەبیـــنە دۆزەخ، یەســـوع بە بەردەوامـــی دادەبەزێـــتە نێـــو دۆزەخەکانمـــانەوە بـــۆ ئەوەی پێشـــنیاری رزگاربوونمـــان بـــۆ بکـــات". بۆشاییەکی فراوان لەنێوان دۆزەخی بارۆکی میللی و دۆزەخی بۆسۆێی کلاسیکی فیکری هەیە، هەروەها دەڵێ"هەڵەکار بەخۆی ئەشکەنجەدەری خۆیەتی".

**٢- دۆزەخی تەژی لە سەرنشین:**

لەسەدەی شازدە لەگەڵ رووداوی دۆزینەوەی ئەمریکا و ملیۆنەها لە هیندییەکان و سەدان ملیۆن لە پێشینانیان، کە هیچ شتێکیان لەبارەی مەسیح و مژدەدەری(مزگێنی نوێ)وە نەبیستبوو، پرسیارکردن لەسەر ژمـارەی تیاچووەکـان سـەری هەڵـدا، لە راسـتیدا هەڵوێسـتی کڵێسـا لەهەمبەر ئەم بـابەتە، بە تونـد دەهـاتە پێشـچاو لەگەڵ پەسـەندکردنی گـوتەزای(لەدەرەوەی کڵێسـا رزگـاربوون نیـیە). دادگـای پشـکنین لە بۆلۆنیـای ئیتالی مامۆستایەکی بەنـاوی مارسـێلۆ گـالیۆتی(١٤٤٠-١٤٩١) گرت، ئەمە پێش گەشتەکەی کریستۆڤەر کۆلۆمبس بەیەک ساڵ روویدا، چونکە نکوڵیی لە رۆژی حەشری هەتا هەتایی بۆ بتپەرستەکان کردبوو. تیۆلۆژستەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بڕوایان وایە، ئەوانە پاشماوەیەکی ژمارە کەم و پەراوێزخراون بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵە مەسیحییەکان.

دۆزیـــنەوە مەزنەکـــان هـــاتن و گومانیـــان لەســـەر هەڵســـەنگاندنی ژمارەکان ورووژاندەوە. ئایا دەبێ دەست بەم بۆچوونە رەقەوە بگیرێ و بە یەکجار بوونی نەک ملیۆنەها بەڵکو بەملیارەها تیاچووی‌تر بەئاسایی بزانـرێ؟! هەنـدێک وای بـۆ دەچـن، بەڵام هەنـدێ‌تـر بەشـوێن هۆکـاری ســـازاندندا(تەوفیقیدا) دەگەڕێـــن. لـــویس ڤیڤـــیس-ی مرۆڤدۆســـت و تیۆلۆژســـتەکانی وەک فیگـــا، دوســـۆتۆ، مـــارتینیز دو ریپاڵـــدا، دەڵـــێن رێزگرتنـی یاسـای سروشـتی بـۆ خـۆی بەس بـوو، لەکاتێکدا کلـود دو

سایســیل ســەرۆکی قەشــەکانی تــوران، فتــوای ئەوەی دەدا هینــدییە مردووەکـان کە بتپەرسـت بـوون، دەکـرێ بـۆ ئۆلیمپـۆس چـووبن، بەڵام فرانسوا کۆلیوس دکتۆری میلانی دەڵێ: " کەس بەبێ نیعمەتی ئیلاهـی کە بەهـۆی پـاکژبوونەوە بە ئـاو دەسـتی دەکەوێـت، ناتوانێـت بـۆ یاسـای سروشتی وەفادار بێت". ساڵی ۱۹٥۰ ئەم مەسـەلەیە زۆر قسـەی لەسـەر کـرا، لە(فەرهەنگـی تیۆلـۆژی کـاتۆلیکی) هـاتووە گەر کەسـێ(بێبـاوەڕی ئەرێنی)بـێ، واتە ئەوەی سـروش رەتدەکـاتەوە، ئەوا لە تیاچووەکـانە، ئەوەشـی لە دۆخی(بێبـاوەڕی نەرێنـی)یە، واتە ئەوانەی سروشـیان پـێ-نەگەیشتووە، تەمومژاوین.

هەرچۆنێ بێ بە تێڕوانینی قەشەکانی سەدەی حەڤدە و وتارەکانیـان، ژمـارەی تیاچووەکـان زۆر لە ژمـارەی رزگاربووەکـان زیـاترە. لەسـەر زمانی لـویس دوگرینـاد هـاتووە" ژمارەیەکی کەم لە خەڵک رزگـاربوونی هەتاهەتـایی چنـگ دەکەوێ". کاردینـاڵ بلارمـان دەنووسـێ: ژمـارەی ئەوانەی خودا لێیان تووڕەیە، بەژمارەی ئەو دەنکە زەیتونـانە دەچن، کە دەکەونە خوارەوە کاتێ درەختەکە دەلەرێنرێتەوە". ڤنسـان دوپۆڵ دەڵـێ:" وا دەزانم نیوەی مرۆڤ، نەخێر سێ چارەکی سـەرکۆنە دەکرێن بەهـۆی گونـاهی تەمبەڵیـیەوە". گرینیـۆن دو مونفـور واوەتـر دەڕوا و دەڵـێ:" ژمــارەی رزگــاربووان زۆر زۆر کەمە، بەرێــژەی یەک بــۆ دە هەزارە بەلانــــی زۆریەوە" بەڵام جولیــــان لۆریــــۆ کە یەکــــێکە لە کەشیشــــە وتاردەرەکـان، ئامـاری وردی لایە، یەکـێ لە گەڕاوەکـانی دنیـاکەیتـر کە نەناسراوە پێیداوە، لە یەکێ لە وتارەکانیدا بەناونیشانی( دەربارەی ژمارە کەمەکەی رزگاربووان)ـەوە دەڵێ: لەنێو شەست هەزار کەسدا کە رۆژانە لە جیهــان دەمــرن، تەنیــا یەک کەس رزگــاری دەبــێ، ســێ کەســیش

چارەنووســـیان بەر پـــاکژبوونەوە دەکەوێ، بەڵام ئەوەی دەمێنێـــتەوە تیاچووەکانە کە ٥٩٩٩٦ کەسە!.

لەلای مـالبرانش" ژمـارەی تیاچووەکـان لەچـاو ژمـارەی رزگـاربووان بیسـت هێنـدە، سـەد هێنـدە زیـاترە". ماسـیۆن وا دەبینـێ" زۆرینـەی زۆر تیاچووەکـانن" ئەم مەسـەلەیە لەلایەن خـوداوە بە پاشـەکشـێ دانـانرێ، کە ئەگەر ناچار بێ، ئامـادەیە سـەرکۆنەی هەمـوو درووسـتکراوەکانی بکـات، چونکە خودا تاوانباران ناژمێرێت، بەڵکو تەنیا سەیری تاوانەکانیان دەکا".

لەهەردوو ســـەدەی حەڤـــدە و هەژدە، بڕوا(ئیمـــان) رەشـــبینانە و دەســـتەبژێرانە بـوو، ئاسـتێک لە ژیـانی زاهیـدی گەرەکە، کە لە توانـا و حەوسەڵەی زۆرینەی زۆری کریستیانەکان بەدەرە. ئیمـان زیـاتر لـۆژیکی و عەقڵانیتر بوو وەک ئەوەی سۆزداری بێ، ئەنجامەکـان ماتماتیکییـانە بەدەست دەهێنران و بەمێشکێکی ساردەوە سەرکۆنەی خەڵک دەکرا.

**٣- سەرسەختیی سەدەی نۆزدە:**

سەدەی نۆزدە، سەدەی لێبووردە و میهرەبانی نەبوو، بەڵکو ژینگەی ململانێــیە کــۆمەڵایەتی و سیاســییەکان بــوو، بە پــێچەوانەوە کڵێســا کەوتبـووە پێگەی بەرگـری لەخـۆکردن و هەڵوێسـتی بەرپەرچدانەوەشـی بەرەو توندتر ئاراستەی دەگرت. لە زۆرینەی جارەکاندا ئەو کۆمەکی و پشــتیوانییەی کە دەســتی عیلمــانییەت لەســەر ئەم زەویــیە سیســتەمی مۆراڵی بۆ کڵێسا دابین دەکرد، چیتر لەژێر دەسەڵاتیدا نەمـا، برووسـکەی بێزاربـوونی لە دنیـاکەیتـر بەسـەر نەیارەکانیـدا دادەباراند. قوتابییەکـانی فەیلەســوفان و هزرڤانــانی ئــازاد و بــێباوەڕەکــان و لیبراڵەکــان و سۆشیالیســـتەکان و شۆڕشـــگێڕەکان و بانگەشـــەکاران و پـــارێزەرانی عیلمانییەت و زۆریتر، کە هێمـای یـاخیبوونەکانی سـەردەمن، سـەرجەم ئەوانە دە دە و بیست بیست دادەبەزنە نێو دۆزەخەوە.

ئەو پیاوە ئایینییانەی لە دێرە وشکهەڵاتووەکاندا و دوور لە دنیا گەورە ببوون، لەرووی ئەخلاقییەوە لە بەڕێوەبردنی بەردەستەکانیاندا توندوتیژییەکی بێئەندازە نیشاندەدەن. پیار –دینیس بوایێ بەڕێوەبەری ئەکلیرکی سان- سۆڵپیس کە لە ساڵی ١٨٤٢ کۆچی دوایی کردووە، داوا لە کاهینەکانی ئایندە دەکات، بێترس و زێدەڕۆییکردن مامەڵە لەگەڵ کێشەی(مەترسی قیامەتی خودا)بکەن، چونکە کاتێ مرۆڤ قسە لەسەر بابەتێک دەکات، کە خەیاڵدانی مرۆڤ و عەقڵی هەرگیز نەتوانن پێی بگەن، بواری زێدەڕۆییکردن نامێنێ. سەرەڕای ئەوانەش بە قوتابییەکانی گوتووە: ئێوە بێگومان بەخۆتان لە تیاچووەکانن، چونکە بەدەگمەن کاهینێک لە ئاستی بەرپرسیارێتییە مەترسیدارەکانی سەرشانی دەبێت، بەردەوامبوونیش لەسەر بانگەشەکانتان بێسوود دەبێ، سەرکۆنە دەکرێن چونکە بانگەوازی خوداتان رەتکردۆتەوە.

لە چوارچێوەی ئەم بارودۆخەدا، لەو ئاراستە تۆقێنەرە دەگەین، کە سەرپەرشتیارانی ئاسایی و نائاسایی کڵێسا لە شاندە ناوخۆییەکاندا دەیگرنەبەر، بۆ نموونە کاتێ جان ماری دی لامنیێ دەبینین، زوو زوو سەردانی ئەم و ئەو دەکا و نوێژی سەر مردوو بەجێ دەگەیەنێ: گەر وەک وتاربێژ لەنێو گۆڕەکاندا بوەستایە، تابووتێکی پڕ لە کەلەسەری هەڵدەگرت و گفتوگۆیەکی خەیاڵیانەی ساز دەدا و هەموویان وەڵامیان دەداوە، کە گیانیان لەدۆزەخدایە.

ڕێنماییەکانی قوتابخانەگەلی ئەکلیرکی، لای هەندێ کەسی خاوەن دەروونی لەرزۆک، دەمدەمی(واسواسی) تێدا درووستدەکردن بەرانبەر بە دۆزەخ. لەنێو ئەوانەدا خزمەتکاری کڵێسای ئارس، جان ماری ڤیانی، ئەو بەدرێژایی ژیانی، شەیتان ئازاری دەدا، لەهەموو شوێنێکدا هەڕەشەی قیامەت هەستانی دەبینی، لەهزرە پیسەکاندا، لە داڵغەکانی

کاتی بۆنە پیرۆزەکان، لە جنێو و لە هەموو کارێک کە رۆژانی یەکشەممە پێی هەڵدەستا. " گومانی تێدا نییە ژمارەیەکی زۆر لە هاوسەرگیرەکان لەتیاچووەکانن". چ ئومێدی رزگاربوون بۆ ملیارەها بتپەرست نییە کە ئینجیلیان نەناسیوە. خودا بە تۆڵەسەندنەوە دڵخۆش دەبێ، رۆژی حەشر ترسناک دەبێ. رەشاییەکی مەزن لە مرۆڤ فڕێدەدرێتە نێو ئاگری نەمرەوە:" دادگەیەکی تۆقێنەرە، بەڵام لەوپەڕی دادوەریدایە، نەک هەر ئەوە بەڵکو چ شتێ هەیە لەوە دادوەرتر".

لە سەدەی نۆزدەدا خەمێکیتر دێتە پێشەوە، کە پەرەپێدانی شێوازی دەرفەتهێنانە لە دۆزەخ: ئەویش بەرگریکردنە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی. لەساڵی ١٨٥٠ باوە کۆسیت سەرۆکی شاندی مژدەدەران و نێردراوان بۆ تۆلۆز، رایدەگەیەنێ کە شۆڕش دەرەنجامی لاوازی باوەڕە بە دۆزەخ:" دۆزەخ لە هێمای فەرەنسای نیشتمانمان لادراوە، ئەوەتانێ ئازادی مرۆیی، بێ حکومەت و بێ نوێنەر، خۆی فڕێدەداتە چەندین هەڵدێر، کە هێشتا جێ برینەکانی دیارن، ئەو دۆزەخەی لەپێناو دڵنیابوونەوەی زیاتری نکوڵی لێدەکرد، رۆچووەتە قەوارەکەیەوە". باوە کۆسیت دەڵێ:" بڕوا هێنان بە سزای هەتا هەتایی هەڵوەشێننەوە، بۆ ئەوەی دنیا ببێتە بابل".

دۆزەخ بەتەنیا دوایەمین بەربەست نییە بۆ رەوشتی تاکەکەس، هەروەک لە رۆحانیەتی کلاسیکیدا هەیە، بەڵکو دۆزەخ باشترین زامنە بۆ سەقامگیریی کۆمەڵایەتی، خوداش لەپێناوی ئەوەدا ئەفراندوویەتی، هەروەک لە نووسینەکانی کلود لاکودردی کاهینی کڵێسای بایۆ(١٧٥٥-١٨٣٦)دا هاتووە:" سروشتی مرۆڤ گەندەڵییەکی تێدایە، کە بێگومان وای لێدەکا مرۆڤێکی شەڕەنگێز بێ، گەر شتێ نەبێ بیترسێنێ(.....)، نەک تەنیا سزایەک بۆ پاش ژیان، بەڵکو سزایەکی هەتاهەتایی، ئەوە

حیکمەتێکە خودا هێناویەتە بوون. گەر ئەوە نەبوایە ئایا لە توانای کەسدا هەبوو، جڵەوی حەزەکانی مرۆڤ رابگرێ و پارێزگاری لە سیستەم لە جیهاندا بکا؟".

لەکۆتایی چاخەکە، ئامۆچیاری دۆمینیکانیی ناودار جان مۆنسارببیێ، کە لە ساڵی ١٨٧١ تا ساڵی ١٨٩٠ لە کڵێسای نۆتردام لە پاریس لەکاتی رۆژوودا، لەسەر هەتا هەتایی ئەشکەنجەدان وتاری دەدا، دەیگوت:" سوودی کۆمەڵایەتی سەرەکیترینە، ئەوە وەک کورێکی وریا وایە کە باوکی بەخشیویەتی، بەڵام ئەو شتە بەلایەوە چ مانایەکی نییە. گەر دۆزەخ نەبوایە" ئەوا خودا و مرۆڤ تەنیا دوو ئەکتەر دەبوون بۆ کۆمیدیایەکی کڵۆڵ، کە هەمیشە بەوە کۆتایی دەهات، باوکێکی دڵ باش بۆ ئەوەی کورە هیچ و پووچەکەی لەئامێز بگرێت و میراتییەکەی خۆی بۆ بگوازێتەوە، پەنا دەباتە بەر هەموو ئامرازێک". دۆزەخ پێداویستییەکی گرنگە بۆ بەرگریکردن لە خاوەنداریێتی، ئەو" زیندانی دنیاکەیترە" گەر ئەو نەبوایە" نیرۆنمان دەدیت نغرۆ لە شادیدا لەسەر دڵی ساینت ڤنسان دی پۆڵ". زیاد لەوەش گەر دۆزەخ بوونی نەبوایە، کەوایە مەرگی مەسیح لە چ شتێک رزگاری کردووین؟ کەواتە دەبێت چەکی ترسان لە دۆزەخ هەڵبرین، لە تۆقاندن نەترسین بەتایبەتی بوار بە هەست و سۆزەکان نەدەین:" بەزەیی نییە، تکایە، منداڵانە دڵنەوایی مەکەن، فرمێسک نییە! سەبووری بە غەزەب پێکەوتووەکان مەبەخشن کە سووکایەتیان پێ-کردوون، چونکە هەریەکێ لەوان ئیدی خۆی تاوانبار دەکا، خۆی سەرکۆنە دەکا، خۆی بە نەفرەت دەکا".

میدیای ئەکلیرکی تەواو لەگەڵ ئەمەدا کۆک بوو، لە ساڵی ١٩٠١ لەوپەڕی کێشمەکێشەکان لەسەر عیلمانیەت، گۆڤاری(دۆستی ئەکلیرۆس) وەڵامی کاهینێکی دایەوە، کە پرسیاری دەکرد ئاخۆ قسەکردن لەسەر

دۆزەخ، جۆرێــک لە زیــادەڕۆیی تێــدا نەکــراوە بەوەی دەڵــێ:" دەبــێ وێنەکردنی دۆزەخ بە شێوەیەکی نەرم و نیان، خۆمانی لێ دوورەپەرێز بگرین، تا ئەو رادەیەی بڕواداران بتوانن بە چارەنووسێکی دابنێن، کە دەکرێ بەرگەی بگرن، لەبری ئەوەی هەوڵبدەین بڕواهێنان بە دۆزەخ لاواز بکەین بەدیتنەوەی ئاسانکارییە مەحاڵەکان، دەبێ کۆشش بکەین ئەو ترسە بخەینە دەروونی خەڵکەوە، کە لە ئەشکەنجە گەورەکان دەربازیان دەکا، ئەشکەنجەیەک کە چاوەڕێی گوناهبارگەلێکە پەشیمان نین لە خەتاکانیان، ئەم ترسە باشترین رێگەیە تا وایان لێبکا لە گوناهوخەتاباری دوورکەونەوە".

لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا، لە گوندەکانی پۆڵۆنیا، ئەکلیرۆسی بەتوانا بەهەمان شێواز، لادێیەکانی دەترساند، هەروەک ڤنسنتی ڤیتۆس(١٨٧٤-١٩٤٣) لە یاداشتەکەیدا شاهێدی بۆ دەدا و دەنووسێ:" ئەم زیادپێوەنانە دەشێ هەندێ کەسی زۆر هەستیار بگەیەنێتە دۆخی نەخۆشی، چونکە ئەو دۆزەخەی چاوەڕێی گوناهباران دەکا و بەو شێوە ترسناکە وێنا دەکرێت، دەشێ ببێتە هۆی شڵەژانێکی بەهێز".

شــان بەشــانی ئەوە بەشــێوەیەکی زۆر ورد و سەرســووڕهێنەر، بیروباوەڕەکان هێشتا لە چوارچێوە دەدرێن، لە بەلاڕێدابردن و هەڵەی مێژوویی، کە هێندەی سەدەی نۆزدە، کتێب لەسەر دۆزەخ دانەنراوە، تێیاندا بەوردی باس لەهەموو مەرجەکانی لێبووردن و ئەشکەنجەکان و ژیانی تیاچووەکان کراوە، شەڕ لەسەر ژمارەی هەڵبژێردراوەکان لەوپەڕیدا بوو. لە ساڵی ١٨٩٧ تیۆلۆژستی ئەڵمانی، هێنریخ، لە کتێبەکەیدا( تیۆلۆژستی ئەدەبی) دەنووسێ:" بوار بۆ سەرکۆنەکردنی بتپەرستان نەماوە". لە ساڵی ١٨٩٨ شوێنکەوتەی یەسوع کاستلاین لە کتێبێکیدا بەناوی( توندوتیژی و ژمارەی هەڵبژێردراوەکان و دیکترینی

رزگاربوون)، رای‌دەگەیەنێ کە بێگومـان تیاچووەکـان کەمینەن. لە سـاڵی دواتــردا ئێــف. کەی. گــۆدتس ئەم بۆچــوونە لەکتێبێکــی گەورەدا رەت-دەکـاتەوە، کە بە لاتینـی دایـنـابوو بەوەی" ژمـارەی رزگـاربووان کەمـن" تێیدا ۷۳ لە بـاوانی کڵێسـا و ۷٤ تیۆلۆژسـت و ۲۸ شـرۆڤەکاری پەڕاوی پیرۆز، سـەلماندوویانە کە ژمارەی تیاچووەکـان لە ژمـارەی رزگـاربوان زیاترن. لە ساڵی ۱۹۱۳(فەرهەنگی تیۆلۆژستی کریستیانی) چارەنووسی بێباوەڕان و چارەنووسی شێتەکان بەرانبەر یەک دادەنێ و دەڵێ:" پلەی جۆراوجــۆر لە شــێتیی هەیە" ئەم پــلانە بەرپرســیاریێتییەکان لەســەر کارەکــان کەمدەکــاتەوە. بــالمێس-ی تیۆلۆژســت دەنووســێ (دۆخــی گەمژەیـی) کە ژمـارەیەکی زۆر لە دڕنـدەکانی تێـدا دەژیـن، دەکرێـت لە رۆژی دواییــدا ببێــتە فریادڕەســیان، چــونکە زۆر لەوە گەلحــۆترن کە خودای راستەقینە بناسـن. لە سـاڵی ۱۹۲٤ ئەی. میشـاڵ ئەم لێبووردەییە لە کتێبەکەیـدا(کۆتاییەکانی دوایـی) سـەرکۆنە دەکـا و بە لێبـووردەییەکی تاوانکارانەی دادەنێت.

تیۆلۆژســتەکان لە تــاوتوێکردنی دۆخەکــانی دۆزەخــدا، زۆر جەنگــی بەردەوام و نەزۆکیــان ئەنجــامدەدا، لەکاتێکــدا بــوونی خــودی دۆزەخ کەوتبووە ژێر هەڕەشەوە.

**٤- رەخنەگرتن لەدۆزەخ (هەردوو سەدەی هەژدە و نۆزدە):**

لەناوەڕاستی سـەدەی حەڤدەوە، هەندێ خـاڵی سـەرەکی لە دیکترینی دۆزەخ کەوتە بەر هێرشـی ناوەندە جۆراوجۆر و ئـازادیخوازەکان، وەک رەوتگەلێکی پرۆتستانتی و هەندێ کەسی جولەکە. لەساڵی ١٦٥٤ کتێبێک لەلایەن پزیشک و فەیلەسوفی ئەڵمـانی سونەر لەپاش مردنـی بڵاوبۆوە، ناونیشانەکەی کورتکراوەی نـاوەڕۆکەکەیەتی:" سـەلماندنێکی تیۆلۆژسـتی و فەلسـەفی بۆ ئەم دۆزە، کە ئەشـکەنجە هەتاهەتاییەکـانە و گوناهکـاران

دەیچێـژن، ئەوە جەخـت لەسـەر دادوەری خـودا ناکـات، بەڵکـو نیشـانەی ستەمکاریەکەیەتی".

دوای سـێ سـاڵ بەشـێوەیەکی گاڵتەجـاڕیی، سـیرانۆ دی برجـواک لە کتێبەکەیـدا(مێژووی کۆمیـدیای دەوڵەتـانی مانـگ و ئیمپراتۆریاکـانی) دەرفەت لەو هەڵە قەبەیە دێنـێ، کە خـۆی لە دادگـاییکردنـی گـالیلۆدا دەبینـــێ لە ســـاڵی ١٦٣٣، لەســــەر زاری یەکــــێ لە یەســــوعییەکان لێکدانەوەیەکی سـەیر بـۆ سـووڕانەوەی زەوی دەکـا و دەڵـێ" وا خەیـاڵ دەکەم زەوی دەســـووڕێتەوە نەک لەبەر ئەو هۆیــانەی کۆپەرنیکــۆس بانگەشەی بۆ دەکرد، بەڵکو لەبەر ئاگری دۆزەخ هەروەک پەڕاوی پیرۆز فێرمان دەکـا، بەوەی دۆزەخ خزاوەتە سـەنتەری زەوییەوە، تیاچووەکان هەوڵدەدەن لە گەرمیــی گــڕەکەی هەڵبــێن، بەوردی ســەردەکەون تــا بەدوور بــن و بــگەنە قــوببەی دۆزەخ، بەو جــۆرە وا دەکەن زەوی بســووڕێتەوە هەروەک ســەگێ خلــۆکەیەک ببزوێنــێ کــاتێ لەنێویــدا رادەکات".

دۆزەخ بـۆ بێباوەڕەکـانی سـەدەی مەزن و خراپەکـارانی، بـۆنەیەکی نایابە بۆ گاڵتەکردن و سووکایەتیکردن بە ئایین. جان دۆمینۆی کافر لە ١٦٧٠دا ئاوهـا دەڵـێ:" ئایـا ئەمـانە هەمـووی درۆ نـین یـان قسـەی هـیچ و پـووچ نـین یـان خەوبزڕکانـدن نیـیە". هەروەهــا فەیلەســووفەکانیش لە پەراوێزی ئەرتۆزۆکسی ئایینە گەورەکان وەک سپینۆزا و هـۆبز، نکوڵی لەهەموو شتێ دەکەن کە باس لە سزای پاش مردن بکات.

لەنێـوان ســاڵانی ١٦٨٠ و ١٧٢٠ و لەکاتی(مەرگەســاتی ویژدانـــی ئەوروپی) کە پۆڵ هـازار بەشـێوەیەکی نایاب مـامەڵەی لەگەڵدا کردووە، هەر لەنێو خودی کڵێساوە هەڵمەتەکان دەستی پێکرد.

ئەو نووسەرانەی ئامادەكارییان بۆ خوداییەكان( ئەوانەن كە تەنیا خودا دەپەرستن) دەكرد، هەست و عەقڵی رەخنەگرانەیان بەكاردێنا، بۆ ئەوەی بەتایبەت نكوڵی لە هەتاهەتایی ئەشكەنجە بكەن. لەساڵی ١٦٩٥ عابیدێكی خودا بەناوی شۆلیۆ دەنووسێت:" خودای من خودایەكی بێ-بەزەیی نییە" ئەو ئەم كارە قێزەونانە ناكا. بارۆن دۆلا هۆنتان لە ١٧٠٣ پشتیوانی لەم بۆچوونە كرد. بیرۆكەی ئۆریجینۆس سەبارەت بە رزگاربوونی سەرتاسەری دووبارە سەری لەگەڵ ( ئینجیلی سەرمەدی بۆ چاككردنی هەموو بوونەوەرەكان بەشێوەیەكی گشتی) سەری هەڵدا، كە كتێبێكی فەرامۆشكراو بوو، لەساڵی ١٦٩٩ دەركەوت. هەروا (نهێنی چاككردنی گشتگیر) كە خاوەنەكەی جان گلیۆم پیتەرسۆن بوو، لەنێوان ساڵانی ١٧٠٠ و ١٧١٠ لەسێ بەشدا بڵاوبۆوە. لەساڵی ١٦٩٧ بوسۆیێ، نوای، سەرۆكی ئوسقوفەكانی پاریس، لۆتیلیێ سەرۆكی قەشەكانی ریمس، ئیمزا لەسەر بەیاننامەیەك دەكەن بۆ سەركۆنەی بۆچوونی كاردینال سفۆندرات، كە پەیوەندی بەو منداڵانەوە هەبوو، بە كەمێك بەزەییەوە مردوون بێئەوەی بەئاو پاكژكرابن. ئەمە تەنیا ختووكەیەك بوو شان بە شانی ئەو هێرشانەی پیار بایل دەیكرد و مەسەلەكەی قووڵتر دەكردەوە:" چەمكی دۆزەخ بەخۆی هەرگیز لەگەڵ بەزەیی و میهرەبانی خودادا یەكناگرێتەوە. دەستگرتن بەوەی مرۆڤ ئەوپەڕی ئازادیی هەیە، دوای ئەو هەمووە بڕوای بە رزگاربوونی هەبێ، ئەوە پاساوێكی پووچەڵە: خودا دەزانێت كە زۆرێك بە خراپی ئەم ئازادییە بەكاردێنن و بڕیاری تیاچوون بەسەر خۆیاندا دەسەپێنن. مەحاڵە خودا شتەكانی ئاوها بەجێ هێشتبێت، كە بەمشێوەیە بەڕێوە بچێت". تەنانەت دۆزەخی مەودا دیاریكراویش ناكرێ جێی رەزامەندی بێ:" ناتوانن بگەنە ئەوپەڕی چاكسازیی خودا، ئەگەر تا دوا خولەك ئەشكەنجەی دۆزەخ

نەچێژن، سەبارەت بە سوودی کۆمەڵایەتی ئەم هەڕەشـەکردنە بە دۆزەخ ئەوەنـدە بەسـە، کە بگەیـنە دەرەنجـامێ بەوەی ڕیـژەی خراپەکـاران لای کریسـتیانەکان دەگـاتە هەمـان ڕێـژە لە ئایینەکـانی دیـکە و لای بـێ-باوەڕەکانیش".

کڵێسـا سـەرکۆنەی هەمـوو کـارە ناڕەواکـان و سـەرجەم دانراوەکـانی بایڵ قەدەغە دەکا. بەڵام لایبنز لە ساڵی ١٧١٠ بە تۆژینەوەیەکی فەلسەفی وەڵامـی ئەوە دەداتەوە، لەژێـر نـاوی( وتـارە تیۆلۆژسـتەکان چارەسـەری نایـابی خـودا و ئـازادیی مـرۆڤ و بـنەچەی مـرۆڤ). " دۆزەخ بەلای ئەوەوە، بە تەواوی لەگەڵ هـارمۆنیەتی گەردوونیـدا دەسـت لەملانێـی یەکتری دەبن، کە ئیتر هاوسەنگیی باڵ بەسەر هەموو شتێکدا دەکێشێت". ئەو دەنووسێ:" ڕەنگە نەمریی تۆباوییەکان لەچاو سەرفرازی خواوەندیدا لە مەزنییەکـدا بێـت، کە ناکرێـت ئـازاری تەواوی تیاچووەکـانی لەگەڵـدا بەراورد بکرێت". زیـاد لەوەش تەنـانەت گەر زۆرتـرین کەس تیـاچووبێ، هاوسـەنگییەکە بەهـۆی ڕزگـاربوونی ئەو بـوونەوەرانەی لە دەرەوەی دنیـای زەوی دەژیـن، حـوکمەکە ڕاسـت دەکـاتەوە:" بەڵام سـەبارەت بە ژمارەی تیاچووەکان، گەر زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی ڕزگاربوان، ئەمە نـابێتە ڕێگر لەوەی بوونەوەرە بەختیارەکـان لە گەردوونـدا ژمارەیـان لە بوونەوەرە کڵۆڵەکان کەمتر بن".

ئەمجۆرە پاسـاوانە بۆ فەیلەسـووفەکانی سـەدەی هەژدە، چێژبەخش بـــوون، هەر لە ڤـــۆلتێرەوە کە لە(فەرهەنگـــی دۆزەخ)دا داهێنـــانێکی ئامـادەکراوی لەدۆزەخ هێنـایە ئـاراوە بـۆ ڕووکەشکردنـی بۆشـاییەکانی دادوەری مـرۆڤ. سـەرجەم فەیلەسـووفەکان تـا ڕادەیەک دژ بە دۆزەخ کۆک بوون. مۆنتسکیۆ بەتایبەتی دژی سیفەتی هەتاهەتایی دۆزەخ بووە، ئەمەشـی لە وتارێکدا بەناونیشـانی(دژی سـەرکۆنەکردنی هەتاهەتاییـانەی

بتپەرستەکان)ئاماژەی پێکردووە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧١٧. مارمۆنتێل وا دەبینێ دۆزەخ ئەو بارە گرانەیە کە لەسەر ئەم زەمینە، سەرکردە سیاسییەکان دەیخەنە سەرشانمان. دیدیرۆ دەڵێ:" ماوەیەکی زۆرە داوا لە تیۆلۆژستەکان کراوە، رێکخەر بن لەنێوان بیروباوەڕی ئەشکەنجەی هەتا هەتایی و بەزەیی بێپایانی خودا، بەڵام هێشتا ئەوان لەسەر هەڵوێستی خۆیانن". ئەم باوەڕە بۆ دۆلباخ مەحاڵە. قەشە ساڤوا دو رۆسۆ زۆر وردتر دەیگوت: پێویستە بەدڵنیاییەوە سزای خراپەکاران بدرێ، بەڵام سزا لەم ژیانەوە دەست پێدەکا، لەگەڵ ئەو ئازارەی خراپەکاران دەیخەنەوە، بێگومان بۆ پاش مەرگیش بەردەوام دەبێ، بەڵام بەشێوەیەکی کاتی و تەنیا ویژدان نائاسوودە دەبێ.

بیرۆکەی رزگاربوونی تەواو، تەنانەت لەنێو ئەکلیرۆسیشدا بە شەرمەوە بڵاودەبێتەوە. لە ساڵی ١٧١٦ پیار کۆبێ قەشەی یاساناس لە ئەبرەشیەی سەینت دەنووسێ: ئاسمان کراوەیە بۆ هەموو خەڵک یان بۆ تۆژینەوەی تیۆلۆژستی، بە پشتبەستن بە پەڕاوی پیرۆز و عەقڵ، بێ- ئەوەی سووکایەتی بە کردەوە ئایینییەکان بکەین تا بەهۆیەوە بەتاسە و تینەوە بیسەلمێنین، کە تەواوی خەڵک رزگاریان دەبێ. کتێبەکە تا ساڵی ١٧٤٣ ئەوجا بە ئینگلیزی بڵاوکرایەوە، لە ساڵی ١٧٦٧یش بە فەرەنسی. بەهەمان بیرکردنەوە و زەینەوە بەڕێز لویس لە ساڵی ١٧٨٢ لە کتێبەکەیدا(ئاسمان بۆ هەموو گەردوون کراوەیە) دەنووسێ: دۆزەخ تەنیا چیرۆکێکی ترس و بەدییە، دەکرێ ئەو هەسارەیەی رووناکمان دەکاتەوە بۆ دواوە بگێڕێتەوە.

لەکۆتایی سیستەمی کۆن و لەناوەندەکانی هزرڤانانددا باوەڕبوون بە دۆزەخی تەقلیدی، تووشی راچڵەکینی ترسناک دەبێ. ئەم باوەڕە لای فیلیپ ئەریاس هەر نەما، کەچی رێنماییەکانی کڵێسا لەم خاڵەدا

بەخـۆڕاگری دەمێنێـتەوە، لەگەڵ پێشـڤەچوونێ گرنـگ لە پاسـاودا، وردە وردە هۆکارگەلی تیۆلۆژستی لەلایەن قازانجی کۆمەڵایەتییەوە، جێیان پێ چۆڵ دەکرێ، بەوەی دۆزەخ باشـترین پـارێزەرە بـۆ سیسـتەم و مـۆراڵ، کەواتە دۆزەخ پێویسـتە. ئەمە بیرکـردنەوەی بـاوە برجێـی بـوو، دانەری وتـاری(دۆزەخ) لە ئەنسـکلۆپیدیا. هەنـدێ لە شۆڕشـگێڕانیش ئەم پاسـاوە دۆگماییە پیادە دەکەن وەک ناوبراو شۆمان –ی تیۆفیلانترۆپ[٨٨].

بیروبـاوەڕەکە هەروەک خـۆی مـاوەتەوە، لای بـاوەڕدارانی بەگشـتی هیچی لێنەهاتووە، لەکاتێکدا بیری نوێ سەری هەڵدا، لەنێو کەمینەیەکی کەمدا قەتیسی بەستبوو. بەمجۆرە دەکرا کتێبی(سـاد) وەک ئـارەزووییەک بۆ سەرکۆنەکردن و بەدیهێنانی دۆزەخ لەسەر زەوی لێکبدرێتەوە.

شـڵەژانی شۆڕشـگێڕیی هەڵوێستەکانی کۆنکرێتیتر دەکرد: بێـزاری لە بـاوەڕ لای ئەکلیـرۆس بەرەو بەهێزبـوون چـوو، هەڵکشـانی نـاڕەزایەتی و پاشەکشەی ترس لای باوەڕداران زیادیکرد و دۆزەخی عیلمانیەتی نـوێ هاتنە ئاراوە.

---

٨٨ : زاراوەیەکە بەواتای(دۆستانی خودا و مرۆڤ) دێت، کە رچەیەکی فەلسەفی بوون لە فەرەنسا سەری هەڵدا، لە ساڵی ١٧٢٩ سەرەتای گەلاڵەبوونی ئەم رچەیە بوو، کە بڕوای بە بوونی خودایەکی بەتوانا و بە بەزەیی هەیە.

## بەشی نۆیەم
## گۆڕانكارییەكانی دۆزەخ
## سەدەی نۆزدە- سەدەی بیست

بەدرێژایی هەردوو سەدەی دوایی، هەندێک جێگۆڕكێ بەسەر چەمكی دۆزەخدا هات. پاش فراوانبوونی واتای ئەم دەستەواژەیە كە بەدەستكاریی زمانەوانیانە بووە واتابەخشی هەموو دۆخێكی دژوار، كە لە گوزارشتە هەنووكەییەكەیدا بەشێكی گەورەی لە هێز و تواناكەی لەدەست دا، ئەم گۆڕانە مەزنە بەهۆی گواستنەوەی شوێنە تایبەتەكەی خۆیەوە بوو. دۆزەخی كریستیانی تەقلیدی، كە ئەگەری پێشكەشكردنی لە كتێبی فەیلەسووفەكانەوە هەنگاوی دەسپێكی نا، بەهەمانشێوەش لە زەینی میللەتدا پاشەكشەی كرد. بووە ئامانجێ بۆ راستكردنەوەیەكی قووڵ لە تیۆلۆژستی كلاسیكی، بەتایبەتی لەمیانی بەستنی كۆڕی دووەمی ڤاتیكان. ئەو نەرێنییانەی پێشتر شێوازی تۆقێنەرانەی قەشەكان هۆكاری بوون، كڵێسای هاوچەرخی شڵەژاند، بەرادەیەک گەیشتە ئاستی شاردنەوەی راستەقینانەی وشەكە لە زمانی كڵێسایی. خودی چەمكەكە بەردەوام بوو، بەڵام تەنیا بە واتا رۆحانییەكەی، كە هیچ پەیوەندییەكی پتەوی بە چەمكی تەقلیدیەوە نەمابوو. شان بە شانی ئەوە، شاعیر و فەیلەسووفەكان كەوتنە هەڵقۆستنەوە لە دۆزەخ، كە بووە توخمێكی سەرەكی لە رەوتە هزرییە زۆر و زەوەندەكانی بێباوەڕیی، هەروەک جان گیتۆن تێبینیی كردبوو، " لەم زەمەنەدا كە بڕوادارانیش ئارەزووی

کاڵکردنەوەی هێزی هەتاهەتایی مەرگ دەکەن، شتێکی دژ بەیەک و نامۆ نییە لەنێو ریزی هزرڤانە نکوڵیکارەکاندا کە تا رادەی کفرکردنیش دەچن، گەڕان بە شـوێن دەسـتەواژەیەکی ورد بە پێویسـت بـزانن بـۆ دنیـای دۆزەخیـی. رەنـگە لای هـزری عیلمـانی مەسـەلەی بـوونی دۆزەخ(بەدەر لەوەی چ بیروباوەڕێک بانگەشەی بۆ کردووە)، هیچ سـەردەمێ وەک ئەم سەردەمە، هێندە جێی بایەخ و پەیوەستبوون نەبووبێ».

دۆزەخ لە سـەدەی نـۆزدە، باشـترین بـابەتی شـاعیرە"نەفرەت-لێکراوەکـان" و فەیلەسـووفە تەواو رەشـبینەکان بـوو. لە سـەدەی بیسـت وجودیەت بەکاری هێنا و بووە گوزارشتکردنێ لە نەهـامەتی سـەرەکیی مـرۆڤ. ئەو بیـرۆکە کـۆنەی کە بەهـۆیەوە دۆزەخ زۆر بە سـادەیی بە بـارودۆخی مـرۆڤ هەژمـار دەکـا و لە دوو هەزار سـاڵەوە لەلایەن لـۆکریس پشـتیوانی دەکرێـت و دواتـریش رەوتە ئـایینییە جیابۆوەکـان پیادەیان کرد، گەیشتە ئەوەی خۆی بسەپێنێ، ئیدی دۆزەخ لەژێر زەویدا نەمـا، بەڵکـو لەسـەر زەویـیە و لەدڵـی مرۆڤـدایە. ئەم بیـرۆکەیە تـا ئەو رادەیەی بیری لێدەکەینەوە لە زانستی تیۆلۆژییەوە دوور نییە.

**١- پاشەکشەی ترس لە رۆژی دوایی:**

لەدەوروبەری ساڵی ١٦٨٠ یەکەمین گومـان لە مەسـەلەی کـاریگەریی ترس لەدۆزەخ، لەسەر زمانی وتاربێژە ئایینییەکان دەرکەوت، کە تووشی سەرسـامی هـاتن، بەهـۆی ئەوەی وتـارە ئایینییەکانیـان چ ئەنجـامێکی نەبـووە. هەمـاهەنگی لەنێوانیانـدا تەواو بـوو. بـاوە فرۆمـۆنتییەر تـێ-نەدەگەیشـت بـۆچی سـەرباری ئەو هەوڵەی دەدرێـت، بـۆ ترسـاندنی بڕواداران، کەچـی کەس لە ترسـاندا نـالەرزێ. قەشـەی کرملـی، سـیمۆن، سـەری سـووڕدەمێنێ و دەڵـێ: هەڕەشـەیان لـێدەکەی، بەڵام کەس ناگەڕێتەوە و تۆبە ناکات. باوە دۆلا کۆلۆمبیر بەمجۆرە سەرسووڕمانی

خۆی دەردەبڕێ: دۆزەخ هەیە و گاورەکانیش ئەوە دەزانن، دۆزەخ پڕە لە گاورەکـان!. بـاوە لۆریـۆ وتەکـانی بەڕووی گوێگرانـدا دەدا و رای- دەگەیەنـێ" هەڵوێسـتی ئێـوە وام لێـدەکا واز لە پەیـامەکەم بێـنم". ئەم دیـاردەیە لە سـەدەی هەژدەدا زەقتـر دەبێـتەوە. بـاوە کۆمباسـیریس بە نائومێدییەوە دەڵێ: چیدیکە گاورەکان هەست بە ترس ناکەن، کاتێ بایەخ بە ئایین دەدەن کە راستییەکی ئاشکرا ببینن، هاوکات ناشیانەوێت بێجگە لە خودایەکی میهرەبان، چیدیکە ببینن.

مێژوونوسـە هاوچەرخەکـان وەک فیلیپ ئەریس و پیـار شـانۆ و ژان دولۆمـۆ و فرانسـوا لـۆبرۆن و میشـێل ڤۆڤیـل و زۆرێکـی تـر سـەرقاڵی تـاوتوێکردنی ئەم دیـاردەیە بـوون، بەڵام نەگەیشـتنە کۆدەنگییەک. فیلیپ ئەریـــس دەڵـــێ: هەڕەشـــەیەکی خەیـــاڵی گەر پێشـــتر رووبەڕووی کـۆمەڵگەیەک نەبـووبێتەوە و بەڕاسـتی ئەنجـام نەدرابێـت، ئەوا ئەو کۆمەڵگەیە ناتوانێـت رووبەڕووی ئەم بـانگەوازە سـۆزدارییە ببێـتەوە و لای نەبێتە ترس.

بەڵام فرانسوا لۆبرۆن بیردەکاتەوە و بەپێچەوانەوەی ئەو دەڵێ: ئەم قسەیە ترسناکە بەشێوەیەکی زانستییانە ئامادە کراوە، دواتر بۆ ماوەی سێ سەدە لە چوارچێوەیەکدا بەردەوام بووە تا بگاتە ئامانجی خۆی کە ئەویش: مانەوە لەسەر رێگەی راست بەهۆی تۆقاندن لە سزا.

ئەوی نـاکرێ نکـوڵی لـێبکـرێ ئەوەیە کە ژان دولۆمـۆ لە سـەدەی هەژدەدا گوتوویەتی" کێماسی لە ترسان لەخودا" هاتۆتە ئاراوە. شڵەژانی شۆڕشـگێڕییش ئالیکـار بـووە بـۆ بڵاوبـوونەوەی شـەپۆلی رەشـبینی. قەشـەکانی نیـوەی یەکەمـی سـەدەی نـۆزدە، لە وتارەکانیانـدا دەربـارەی دۆزەخ ناچـار بـوون، بـڕوا بە بـڕواداران بێـنن کە خـودا بـوونی هەیە. لــویس- ئۆگســتین رۆبینیــێ لە ســاڵی ١٨٢٤ بە ئەفسووســەوە رای-

دەگەیەنیَ:" وریایی جێی سادە و ساکاریێتی کریستیانیی گرتۆتەوە، بیَ- ئەوەی گاورەکان زانا بن. زیاتر ئارەزوومەندتر بوون بۆ سەلماندن، پتر خۆیان هەڵدەکێشن و کەمتر متمانەیان بە سەرپەرشتیارانیان هەیە و کەمتر ئامادەسازییان بۆ باوەڕیان بە قسەی خۆیان هەیە، تەنیا بەس نییە راستییە ئیمانییەکانیان بۆ نمایش بکەین، بەڵکو دەبێت بۆشیان بسەلمێنین". قسەو باسەکان لەبارەی دۆزەخ بە" قسەی هیچوپووچ و حیکایەتە کۆنەکان" دادەنێن و گوایە" دۆزەخ گەر هەبێت بۆ تاوانباران درووستکراوە" و " پێویستە باوەڕ بەوە نەکەین کەوا ئاگری سووتێنەری تێدایە". هەموو ئامۆچیاران لە ناوەڕاستی سەدەکە لەم بابەتە نیگەران بوون، هەر لە باوە راڤینیۆن تا لاکور دیر.

پاش ئەوە بە پەنجا ساڵ، بڕوا نەمان بە دۆزەخ بووە کاریَ روون و ئاشکرا. دەنگدانەوەی ئەمە لە رۆژنامەگەلی ئەکلیریکیدا دەبینین، بەتایبەتی لە گۆڤاری(دۆستی ئەکلیرۆس) نامەی قەشەگەلێکی بڵاوکردبۆوە، کە نیگەرانییەکی گەورە گرتوونی لەبارەی داواکاری گوێگر و خەڵکانیان. لەساڵی ١٩٠٦ یەکێک لەو قەشانە نووسیویەتی:" شتێکی سەیرە، چەندین ژن و پیاوی گاور نکوڵی لە بوونی دۆزەخ دەکەن، کە لە هەموو بۆنەیەکی کڵێساشدا ئامادە دەبن، نوێژی عەسریان لەکیس ناچێت، ئەرکە ئایینییەکانیان بە باشترین شێوە بەجیَدەگەیەنن، ئەوان دەڵێن قەشەکان باس لە دۆزەخێکی هەتا هەتایی بۆ ترساندن و مانەوە لەسەر رێگەی راست دەکەن، بەڵام بیَئەوەی خۆیان باوەڕیان پێی هەبێت، چونکە مەحاڵە دۆزەخێک هەبێت وەک ئەوەی ئەوان وێنەی دەکێشن بۆمان". خودا لەمبارەدا دەبێتە باوکێکی بیَبەزەیی. ئەوجا قەشەکە پرسیار لە تیۆلۆژستەکانی گۆڤارەکە دەکا، کە دەبێت چ

هەڵوێستی بگرێتەبەر، ئایا ناکرێ رەوتی قسەکردن لەسەر دۆزەخ بگۆڕدرێ و چارەسەری دیکە بدۆزرێتەوە؟

ئەمە یەکێ لە هاوەڵەکانی دەیخاتەڕوو، کەوا دەبینێ" زۆرێ لە ئامۆچیاران بڕیار دەدەن، خۆیان لە قەرەی ئەم بابەتە تێکچڕژاوە نەدەن". قسەی هەندێ لە شوێنکەوتوان کەوا دیارە ناتوانن وەڵامیان بۆ ئەم قسانە هەبێت" چ باوکێک هەرچەندە بێبەزەییش بێت، ناوازە بێ، کوڕی خۆی بە زیندوویی دەسووتێنێ، لەسەر ئاگرێکی تەنک دەیسووتێنێ، بە مێشکێکی ساردیشەوە لە بەرانبەر ئازارەکانیدا دەوەستێ؟" یەکێکیتر لە قەشەکان دەپرسێ ئاخۆ ئەشکەنجەدانی دۆزەخ، رەنگدانەوەی دۆخی دادوەریی مرۆیی نییە لە سیستەمی کۆندا و ئایا ئاگر میتافیزیکە. ئەوانیتر هەموو پرسگەلە گەورەکانی کلاسیکی دەخەنەڕوو:" رات چییە بەرامبەر ئەو بۆچوونەی دەڵێ کات، سووک-کردنێ بە ئەشکەنجەدانی تیاچووەکان دەبەخشێ؟" ساڵی ۱۸۹۷:" رێژەی ژمارەی رزگاربووان بۆ ژمارەی تیاچووان لە کۆمەڵەی رەگەزی مرۆڤ چەندە؟" ساڵی ۱۹۰۱:" لەنێوان ئەم ژمارە زەبەللاحەی ئەفەرۆزەکان و بەزەیی خودا و ویستی بۆ بەخشینی هەمووان، چۆن لە درووستکردنی رێگەی رزگاربوونیان سەرکەوتوو بین؟" ساڵی ۱۹۰۱:" ئاگر چۆن کار لە گیانەکان دەکا؟" ساڵی ۱۹۰۲.

لە بەرانبەر ئەم لێشاوە پرسیارەدا، تیۆلۆژستەکان خۆڕاگرانە دەوەستن. گۆڤاری(دۆستی ئەکلیرۆس) کە بابەتەکە تووشی شڵەژانی کردبوو، تۆمەتەکانی رەتکردەوە، گوایە دەیەوێ ترس بەکاربێنێ تا بڕواداران لەژێر چنگی خۆیدا بیڵێتەوە و پڕوپاگەندەکارانیشی رەوانەی دۆزەخ بکات..:" ئەم رەخنەیە بە دڵنیاییەوە هەڵەیە و سووکایەتی پێ-کردنێکی مەترسیداریشە ئاراستەی پیاوانی ئایین دەکرێت... ئەوە

جنێوێکی قێزەونە شایانی سزادانە لەبەردەم خودا و تەنانەت لە بەردەم دادوەریی مرۆڤیشدا" بەڵام سەبارەت بە مەسەلەکانی دیکە، گۆڤارەکە بە بەرهەمی(هەستیارییەکی هاوچەرخانەی ساختە)ی دادەنێ، ئەوە" گەر دۆزەخ بوونی نەبێت، وا تێنەگەن مرۆڤ پێویستی بەخۆ هیلاککردنی زۆر بێت بۆ ئەوەی خۆی لە دۆزەخ لابدات".

کەواتە دەبێ بچەسپێت. گۆڤارەکە هەموو پاساوە کۆنەکان دێنێ بۆ بەرژەوەندیی سزای هەتاهەتایی، بەپاساوە ساختەکانیش، چونکە ئەوەی بەلایەوە گرنگە، ئەنجامەکەیە. بەمجۆرە باسکردنی ئەوە راست نییە، کە دۆزەخ پاساودارە لەبەرئەوەی هەڵەیەکە دژ بە بوونەوەرێکی سەرمەدیی ئەنجامدراوە، بەهۆی ئەوەی لەو دۆخەدا هەموو گوناهێ هەرچەندە سەرپێیش بێت شایانی ئەشکەنجەدانێکی هەتاهەتاییە. ئەم پاساوە تەنیا لەگەڵ" عەقڵە کەم ژیرەکان" بەکاردێ، رەنگە عەقڵەکان کەمتر زیرەک بن لەوەی دەرک بە لاوازی ئەم بەڵگەیە بکەن و کاریان لێبکا، ئەم بەڵگەیە بەسەر ئەو دژواری و سەختییەدا زاڵ دەبێ، کە ناهێڵێ بڕوا بە ئەبەدیەتی ئەشکەنجە بکات: ئاکامەکەش وا دێتەوە، کە دەرەنجامەکەی باش دەبێت. لە بەرانبەردا" ئەمە بەڵگەی نەفامی پێشنیازکردنی ئەو وەڵامەیە بۆ عەقڵە رۆشنە بەتواناکان، کە تێبگەن ئەمە بێبەهایە".

هەموو شتێ پشتیوانی لە بوونی دۆزەخ دەکات، تەنانەت(دۆستی ئەکلیرۆس) لەساڵی ١٩٠٣ دوودڵ نەبوو لەوەی لە سەنتەری زەوی دایبنێ، بەو پێیەی گڕکانەکان لەوێن. شەڕەکانی ئەمدواییە نەیانتوانی بەربەستێ بەڕووی شەپۆلەکانی ناڕەزایەتی دابنێن. لەڕاستیدا زۆرینەی زۆری گاورەکان و تەنانەت بەشێک لە بێباوەڕەکانیش کە لەمدواییانە نکوڵییان لە ئایینی مەسیحی کرد، شتێ لە ترس و وریاییان تێدا دەمێنێتەوە، کاتێ نزیکدەبنەوە لە چوونیان بۆ دنیاکەیتر.

لێکۆڵینەوەگەلێکی کۆمەڵایەتی ئاماژە بەوە دەدەن، ئەم ترسە تا رادەیەک روو لەزیادبوونە. لەهەرێمی بەریتانیای خواروو، لەناوچەیەک کە بەوە ناسراوە، زۆرترین جار شاندە ئایینییەکان هاموشۆی لەگەڵیان بووە، ئیڤ لامبێر تێبینی کردووە لە ساڵی ١٩٠٠ەوە" بەڕاستی خەڵک لەگەڵ هەندێ بەرچاوڕوونیدا، بێ چەندوچوون لە دۆزەخ دەترسن" ئایا ئەمە واتای ئەوە نییە کە خەڵک بیردەکەنەوە لەوەی چی پێویستە پێی هەستن تا خۆیان لە دۆزەخ لادەن؟".

ئالان[٨٩] لە(وتەکان)ی ئەم پێشڤەچوونە باسدەکا و دەڵێ:" ترسان لە دۆزەخ نەخۆشییەک بوو لە وڵاتماندا سەرنگوم بوو، هەروەک چۆن نەخۆشیی بەڵەک بەڵەکی نەما. کاتێ منداڵ بووم زۆر لە شەیتان دەترسام، چونکە ئەو بیرۆکە پڕوپووچانە لە رەوانبێژی ئەکلیرۆسدا دەگوتران، زۆر بەڕاستی وەرمگرتبوو".

بەڵام کاتێ هەستمکرد نە باوکم و نە دایکم و نە هاوەڵەکانیان، تەنانەت قەشەکانیش لە دۆزەخ ناترسن، یەکسەر منیش لەو ترسە رزگارم بوو، بەڵام ژیانەکەیتر کە کەسێ نەمابێ بڕوای پێی هەبێت، نابێت پەلە بکەین لەوەی قسەی لەسەر بکەین. بەڵام بەگشتی وا دێتە پێشچاوم ئەم پاڕانەوەیە لە ترس داماڵراوە. ئەمڕۆ بەهێزترین بیرۆکە لای کاسۆلیکە دڵسۆزەکان ئەوەیە کە باشترین هەڵچوونمان، مەرگ کۆتوبەندی ناکات، لەبەرئەوە هۆکارمان هەیە تکا بۆ بوونێکیتر بکەین، کە هەرچییەک باشە تێیدا رزگار ببێ و هەرچیەکیش خراپە تێیدا لەبیر بکرێ(١٩٢١).

---

:٨٩مەبەستی نووسەری ئەم کتێبە، ئالان ئی. بێرنشتاینە، کە خاوەنی کۆمەڵێک نووسین و کتێبە لەسەر تیۆلۆژی، کە گرنگترینیان لە ساڵی ١٩٩٦ بەچاپ گەیشتووە بەناوی( the formation of hell).

بەدرێژایـــی ســـەدەی بیســـت ئەم گــۆڕانە بەردەوام بـــوو، هەر لە ســـەرەتای حەفتاکـــانەوە، رووخـــانێکی راســـتەقینەی بـــاوەڕبوون بە دۆزەخمان بینی. لەهەرێمی بەریتانیای خواروو تێبینییە گوماناوییەکانی ئیـڤ لـۆمبێر کە لەسـەرەتای چەرخـی نـوێ نووسـیبووی، بـوونە قسـەی گـاڵتە و گەپ و خەیـاڵپلاوی، نەک هەر ئەوە، بەڵکـو لەدووتـوێی خۆیـدا چەنـدین تـۆمەتی هەڵگرتبـوو وەک" چـۆن توانییـان وامـان لێـبکەن، بەم شتانە بڕوا بێنین؟ کەللەسەرمان تەژی بوو بەم دۆزەخە، بەم پاکژکارە و بەم هەموو بابەتانە، بەڵام ئێستا قسەی لەبارەوە ناکەن، رەنگبێ نەمـابێ"، " دۆزەخ، ئاخ، نازانم ئاخۆ هێشتا ماوە".

ژمارەکـــان جەخـــت لەوە دەکەنەوە، کە بڕواهێنـــان بە دۆزەخ لەنێـــو سـەرجەم بیروبـاوەڕە ئـایینییە تەقلیدییەکانـدا، زیـاتر تووشـی پاشەکشـە هـاتووە. بەپێـی لێکـۆڵینەوەیەک کە تیمـی تـۆژینەوەی سیسـتەمی بەهـا ئەوروپییەکـــان لە ســـاڵی ١٩٨١ ئەنجـــامیداوە، دەرکەوتـــووە ٧٥%ی ئەوروپییەکان باوەڕیان بەخودا هەیە، ٤٠% بڕوایان بە بەهەشت هەیە، ٢٥% بڕوایـان بە شـەیتان هەیە، ٢٣% بڕوایـان بە بـوونی دۆزەخ هەیە. هێشـــتا ئەم ژمـــارانە تـــا رادەیەک لە بەرزبـــوونەوەدان. ئەم تێکـــڕایە لە ئینگلـــتەرا لە ٢٧%وە گـــۆڕاوە بـــۆ ١٤% لە ئەڵمانیـــا. بەمجـــۆرە لە کریستیانیی دێریندا، دوای پانزە سـەدە لە مژدەدان بە دۆزەخ، کەمتر لە چـارەکێکی مـیللەت پارێزگارییـان لە هەنـدێ بڕوابـوون بە بـوونی دۆزەخ کـــردووە، کە ئەمەش شـــایانی گـــوتن نیـــیە گەر بەراورد بکرێـــت لەگەڵ دۆزەخی کلاسیکی، چونکە زانستی تیۆلـۆژی سـەبارەت بەو بـابەتە زۆر پێشکەوت و گۆڕانکاریی بەسەردا هات.

## ٢- پاشەکشەی دۆزەخی کریستیانی:

ئەو شتەی زۆر دیاربێ و پێی گەیشتبین ئەوەیە، کە دوای چەندین سەدە لە باڵادەستی سەرسەختانەی ئەشکەنجەدانی هەتاهەتایی، بێ-دەنگییەکی قڕوقەپکارانە باڵی کێشا بەسەر ئەم خاڵە سەیرەی دیکتۆریندا. دوایەمین هاتنەنانەوەی پاپا لە جۆرە تەقلیدییەکەی، ئەوی پاپا پیوسی دوازدەیەم بوو، کە لە ٢٣ی مارتی ١٩٤٩ جەختی لەسەر کردەوە:" مژدەدان بە راستییە ئیمانییەکانی سەرەتا و کۆتاییەکانی دوایی، نەک تەنیا لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەرفەتی لە دەست نەداوە، بەڵکو زیاد لە هەر وەختێکیتر بۆتە پێویست و دەبێ دەستی پێوە بگیرێت و بەدۆزەخ ئاگاداربکرێینەوە. بێگومان دەبێ بە شکۆمەندی و ژیرانە مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتە بکرێ. بەڵام سەبارەت بە کرۆکی ئەم راستییە، دەبێ کڵێسا لەبەردەم خودا و خەڵکدا، ئەرکی راگەیاندن و فێرکردن بەبێ هیچ نەرم و نیانییەک بگرێتە ئەستۆ، هەروەک چۆن مەسیح بەگۆی هێناوە: هیچ دۆخێکی زەمەنی ناتوانێت بێ چەندوچوونی ئەم ئەرکە، سووک بکات".

لەو کاتەوە شتێ نەگوتراوە و تا رادەیەک هیچ شتێ دەرنەچووە، بەڵکو لە کۆڕی دووەمی ڤاتیکاندا ئاماژەیەکی کورت درا، بێئەوەی وشەی(دۆزەخ) بەزاردا بێت، بانگەوازێکی شەرمنانەش لە ساڵی ١٩٧١ لە پاپا پۆڵسی شەشەمەوە درا. لەم بەڵگەنامە و لەویتر دەربارەی رۆژی دوایی، ئاماژەگەلێکی تەمومژاوی و دەگمەن هەن. بەتایبەت کاردینال رازینگەر لە ساڵی ١٩٨٩ مخابن دەخوازێ بۆ ئەو (کورتکردنەوە ماتماتیکییەی) لەقسەوخواسەکانی کڵێسادا بەسەر ئەم بابەتەدا هاتووە، ئەو لە کتێبەکەیدا کە پێیدەڵێن(مردن و پشتی مردن) و دوو سەد و حەفتا لاپەڕەیە، تەنیا چوار لاپەڕەی بۆ دۆزەخ تایبەت کردبوو.

بەڵام هۆکـانی میـدیای کاسـۆلیکی لە گۆڤـارگەلی میللـی و زانسـتی، بەتەواوی وازیـــان لەو بیــرۆکەیە هێنـــا، کە لە وتارەکـــان و لە زمـــانی کڵێساشـدا بـزر بـوو. ئەم وشــە مانـدووە بە رابردوویەکـی بـارگران لە فەرهەنگگەلــی ئایینیشــدا لادرا، تەنیــا لەژێــر بــابەتی( رۆژانــی دوایــی) ئاماژەیەکی شاراوە و زۆر ناڕۆشنانە بە چارەنووسی ئاییندەیەکی کڵۆڵ دراوە، بــۆ ئەو کەســـانەی خۆشەویســـتیی خودایـــان رەتکـــردۆتەوە. فەرهەنگی تیۆلۆژی لە ساڵی ١٩٨٨ شـەرمنانە رایدەگەیەنـێ:" هەرچۆنێ بێـت دۆزەخ گوزارشــت لە نــاوچەیەکی خــراپ دەکــا، کە مرۆڤــی تێـدا دادەنێن، ئەوانەش کە خودا ناتوانێ بیانگۆڕێت بۆ چاکەکار، بەڵام ناچار دەبێـت بـۆ هەتاهەتـایی سـزای بـدات". لە کتێبی(ئیمـان) سـاڵی ١٩٧٦ کە تیۆلۆژســـت تـــی. رای. میرمـــێ دایناوە، هـــاتووە:" مـــرۆڤ دەتـــوانێ دەســـتبەرداری ئەوە بێـت کە هیچـی خـۆشنەوێـت" ئەمەش رێـک ئەو توانـــایەیە کە بیـــرۆکەی دۆزەخ رایدەگەیەنێـت". ئەو پێناســـەیەی کـــارڵ راهــنەر وەڕووی خســـتووە زۆر ورد نیـــیە:" دیکتـــۆرینی دۆزەخ مانـــای ئەمەیە: ژیـانی مـرۆڤ لەژێر هەڕەشـەی ئەگەری دارمـانێکی هەتاهەتـایی راســـتەقینەدایە، هەڕەشـــەیەک لە واقیعـــدا بەردەوامە و دەتـــوانێ زۆر ئازادانە رەوتی چارەنووسی بگۆڕێ، بەواتایەکیتر دەتوانێ لە خودا دوور بکەوێتەوە".

هەڵوێســـتی فەرمیـــی کڵێســـا کە(ســـەرنجی فەرمـــانگەی فێربـــوونی بڕواهێنان بە ژیانی هەتاهەتایی و جیهانەکەیتر) لەخۆدەگرێت و لە ساڵی ١٩٧٩ پاپا یۆحەننا پۆڵسی دووەم هەمـواری کرد، رایدەگەیەنێ(مەبەست سەرنجەکەیە) کە کڵێسا" بڕوای بەوەیە سزا هەمیشە چاوەڕێی گوناهبـار دەکـات، کە بێبەش دەکرێـت لە بینینـی خـودا، ئەنجـامی ئەو گونـاهەش لەســـەر تەواوی گیـــانی گوناهبـــار بەجـــێدەهێنـــرێ". بەڵام راگەیانـدنەکە

هۆشــداری دەدا:" دەبــێ لە مەترســیی خەیاڵــدان و چــۆنێتی وێنــاکردنە خەیاڵییەکــان بەدوور بــین، چــونکە زێــدەڕۆیی و قــاڵبوونەوە تێیــدا تــا رادەیەکــی زۆر بەشــێ لەو بارگرانییــانە درووســت دەکــا، کە ئیمــانی کریستیانی تووشی دەبێ(...) نە پەڕاوێن پیرۆز و نە زانستی تیۆلۆژی، هیچ کامیان وێنەیەکی تەواویان لە جیهانەکەیتر پێنەداوین".

تیۆلۆژستەکان دەخوازن سەرلەنوێ بیروباوەڕی کۆن داڕێژنەوە، بەڵام نغــرۆی سەرســامییەکی راســتەقینە بــوون، وشــەی گونجــاو نــادۆزنەوە. فەرهەنگــی تیۆلــۆژی کریســتیانی لە ســاڵی ١٩٧٧ دان بەو راستییەدا دەنێ و دەڵێت:" کاتێ شتێک نازانین، مەحاڵە بتوانین شتێکی لەبارەوە بڵێین، ئێمە تەنیا یەک شت دەزانین، ئەویش ئەوەیە کە: گەر بەتوندی بەگژ گوناهدا نەچینەوە، دۆزەخ لەنێو ئێمە و بەهۆی ئێمەوە کامڵ دەبێ". ئەم بۆچوونە نوێیە کە هەڵوێستێک لەبارەی دۆزەخ روون-دەکاتەوە، وەک شکستی ئازادیی مرۆییە کە دەستەوسانە لە دۆزینەوە یان هێنانەئارای واتای بوون، بەجۆرێک لە قووڵایی ئەو واتایەدا لەگەڵ چەمکگەلی فەلسەفی هاوچەرخدا یەکبگرێتەوە.

لە سەدەی نۆزدەوە، ئای چەند سەیرە، شاعیرگەلێکی فەیلەسووف و بێباوەڕ دەستیانکرد بە دووبارە وێنەکێشانی دۆزەخ. ئەم دۆزەخگەلە نوێیە، کە تەواو زەمینی بوون، بەرەنجامی میتافیزیک بوو، کە توانی هزرێن تیۆلۆژستەکان تەواو بکات.

**٣- دۆزەخگەلی نوێ(سەدەی نۆزدە):**

لەدەوروبەری ســاڵی ١٨٨٠ ئۆگەســت رۆدان کــارێکی زەبەللاحــی ئەنجام دا، ئەویش دەرگای دۆزەخ بوو، لەسەر دەروازەکەی پەیکەرە ناودارەکەی(هزرڤان)ی دانا. گەر راستگۆیانە قسە بکەین، ئەوە کارێکی رەمزییە. سەدەی نۆزدە دۆزەخی زەمینی دۆزییەوە. بیرکردنەوەی

هزرڤانانی رۆژاوای لە جیهانەکەیترەوە گۆڕی، کە بۆ چەند سەدەیەک جێی سەرنجیان بوو، بەرەو جیهانێکیتر. دەریشکەوت زانیارییە عەقڵ داگیرکارەکان، کە لە جیهانێکی بێخەوشدا دانراون، لە واقیعدا دەرکەوتەی چەند راستییەکی رێژەیی ئەم دنیایەن. سەدەی نۆزدە پەردەی هیچگەریی لە عەقڵەکاندا دڕاند. دوای ئەوەی مرۆڤایەتی لە رامانی جیهانی ئیلاهیدا نغرۆ ببوو، دەستیکرد بە تەماشاکردنی خۆی لە ئاوێنەکانی کۆمەڵناسی و دەروونناسی و مێژوو و جوگرافیا و فەلسەفە. ئەوەی کە پێیگەیشت مەرگەسات بوو، پاشماوەی هیچ سیستەمێکی ئیلاهی نەبینی، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئاژاوەیەکی بەدیکرد، باشترین حەق تێیدا حەقی بەهێزەکانە، چاکە تەنیا یەک واتای هەیە و ئەویش بەرژەوەندیی زۆرینەیە، واتە خراپە کەمترینە. بۆی ئاشکرابوو کە ژیان بزاوتێکی نەزۆکە لەنێو ئازارگەلێکدا کە بێئامانجە و هیچ واتایەکیشی نییە. " ئەوە چیرۆکێکە شێتێک دەیگێڕێتەوە، تەژییە لە ژاوەژاو و تووڕەیی، هیچ واتایەک نادا" شکسپیر لەسەر زمانی ماکبێت ئەمەی گوتووە.

بەکورتی سەدەی نۆزدەیەم ئاشکرایکرد کە دۆزەخ لەسەر ئەم زەمینەیە. ئەمە ئەوە بوو کە شاعیرە(نەفرەتییەکان) گێڕەرەوەکان لەسەر شێوازی خۆیان گوزارشتیان لە دۆخە مرۆییەکە دەکرد، ئەمە ئەوەیە کە بۆدلێر لە(گوڵەکانی خراپە) دەیڵێت و دەرک بەوەش دەکات کە نوقم دەبێ:

شۆڕ بەرەوە، شۆڕ بەرەوە، ئەی قوربانیگەلی کلۆڵ

شۆڕ بەرەوە بەرەو رێگەی دۆزەخی نەمر.

ڤەرلین لە قەسیدەکەی(وەرزێک لەدۆزەخ)، دەگاتە ئەنجامێ کە" بێچارەیی خودامە". رامبۆ دەگاتە رادەی نکۆڵیکردن لە دۆزەخی

کریستیانی و دەڵێ:" من بڕوام بەدۆزەخ هەیە، کەواتە من لەنێویدام، ئەوە لەسێدارەدانی راستییە، مـن دیلـی بەئـاو پـاکژکردنەوەکەی خـۆمم. ئەی دایـک و بـاوکم، ئێـوە بێچـارەیی مـن و خۆشـتان درووسـتکـرد، ئـای چ بێگونـاهێکی هەژارە! دۆزەخ نـاتوانێ پەلامـاری بتپەرسـتەکان بـدات، ئایـا ئەمە پاش ژیانە! دواتر چێژی رۆژی دوایی زۆر قووڵتر دەبێ، یەک خەتا و زۆری پێناچێ لە نەبووندا نغرۆ دەبم بەپێی یاسـای مرۆیـی(...) دەبێت دۆزەخـێکم بـۆ تووڕەبـوون هەبێـت، دۆزەخێـک بـۆ فیـز، دۆزەخـێ بـۆ تەمبەڵـی، دەسـتەیەک لە دۆزەخەکـان. مـن لە بێچارەییـدا دەمـرم، ئەوە گۆڕە، بەرەو لای کرمەکـان دەچـم، بەرەو لای تـۆقێنەری ترسـەکان! ئەی شـەیتانی دێـوەرە، دەتەوێ بە ئەفسـوونەکەت بەسـەرمدا زاڵ بیـت، مـن داوات لێدەکەم، من داوای لێدانی شەنەیەک[٩٠] و پشکۆیەک ئاگر دەکەم".

لۆتەر یامون هەڵدەستێ بە سـازدانی گەشـتێکی نەفرەتلێکراو بۆ دۆزەخ، هەوڵێکـی کڵـۆڵانە بـوو بـۆ دەرکردنـی شـەیتانەکان لەدۆزەخـی زەمینـی و زاڵبـوون بەسـەر ترسـەکانی منداڵیدا. شـاعیرگەلی نەفرەتلێکـراو لەسـەر گرتنەبەری رێی خەونی رەبەنیانە و دۆزەخی مەسیحیی میللی بەردەوام دەبن.

فەیلەسـووفەکان جێـی تیۆلۆژسـتە سـوپەرمانەکان دەگـرنەوە. شـۆپنهاوەر(١٧٨٨-١٨٦٠) پـێچەوانەی لایبنتـزە، ئەو تەواو رەشـبینە: جیهانی ئێمە خراپترین جیهانە، لە ئەنجامی ویسـتێکی گەندەڵەوە هـاتووە، بۆ ئەو ئەم جیهـانە بێجگە لە دنیـایەکی ئـازار چیـدیکە نییـە:" ئـازار ئەو وێنەیەیە کە بەهۆیەوە ژیان بەرجەستە دەبێ" ئەوە ئێمەین دۆزەخ نەمـر دەکەیـن، بە ویسـتی ژیـانی شـەیتانی کە دەبـێ تێیپەڕێنـین بـۆ ئەوەی بە

---

:٩٠ئامێرێکی کشتوکاڵییە بۆ شەن و کەوکردنی دانەوێڵە بەکاردێت، بەوەی دەدرێتە بەر با تا خودی دەنکی دانەوێڵەکە بمێنێتەوە بەجیا لە کا-یەکەی.

نەبوون بگەین. فۆن هارتمان(١٨٤٢-١٩٠٦) وا رادەبینێ ئەوەی مرۆڤ ناوی ناوە پێشکەوتن، چی نییە بێجگە لە رێڕەوێ کە وردە وردە بەهۆیەوە سەرەخۆشی لەخۆمان دەکەین، ئەم مەسەلەیە بەدڵنیاییەوە بەرەو دارِمانی ویستی ژیانمان دەبات. لە پشت ئەم فەیلەسووفانەوە غنوسی(نۆستیزم) و مانەوی سەری هەڵدا، بەڵام ئەمانیش بە کەساسییەوە پێچراون: ناکرێ خودای چاکە هەرچییەک بێت بەرانبەر هێزی خراپە یەکسان بکرێ".

لە سەرەتاکانی دنیاوە دۆزەخ پێشدەکەوێ و دەگۆڕێ، هەر خودی مرۆڤ دەیگۆڕێ و وازی لێ ناهێنێ، شێوازەکانی ئەشکەنجە و خۆوێرانکردنی بۆ دێنێتەئاراوە. تەماشای لیۆپاردی(١٧٩٨-١٨٣٧) بکە چی دەڵێ:" سروشتی مرۆڤ بەدڵنیاییەوە کلۆڵییە و بەردەوام لە گۆڕانـدایە، سروشتیش ئامێرێکی دۆزەخییانەی ئامادەکراوە بۆ لەناوبردنمان لە رووی جەستەیی و مەعنەوییەوە، بەوەی نەخۆشی و پیریمان بەسەردا دەسەپێنێ، تەنانەت ئەڤینیش کە سەردەستەی ئازارەکانە:" سروشت پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بەرەو خۆشەویستی تا دواتر بە جیابوونەوە و مردن، پارچەپارچەی بکا، ئایا رەوایە بە ئامرازێکی بەختەوەریی، ئازار بدرێین؟".

کیرکیگارد(١٨١٣-١٨٥٥) لەلایەن خۆیەوە بەسەلماندنێکی ماندووکارانەی دووسەرە، پەردە لەسەر دۆزەخ لادەدا، بەوەی لە بناغەی بوونی مرۆڤدایە: کرانەوە لە مردندا بەسەر ئەوانیتردا لە پێناوی خود، یان داخستن لەسەر خود لە خۆپەرستییەکیی شێواودا.

نیتچە دەیەوێ ئەم هەموو دۆزەخگەلی بوونگەراییە بە شێوازێکی کەساسانە تێپەڕێنێ: بەجۆش و خرۆشەوە وەریدەگرێ و بڕوای وایە کە رێکدەکەوێ و ئارەزوویەتی:" بەمجۆرە دەمویست، ئێستا بەمجۆرە

دەمەویٚ و بۆ هەمیشەش هەروا دەمەویٚ!". بەمشێوازە پەنا دەباتە بەر چارەسەری رەواقی، کە خۆشویستنی قەدەری خۆمانە تا خەیاڵێک بەخۆمان ببەخشین کە ئێمە ئاغای ئەوین، ببینە جۆریٚ لە مرۆڤی باڵا و رازیی بین کە خودا مردووە، پێویستە ئێمە شوێنی بگرینەوە، زاڵ بین بەسەر خراپەی مەعنەوی، سنووری چاکە و شەڕەنگێزی ببەزێنین. ئەمە بیٚ ئیرادەگەرییەکی کلۆڵانەیە، رەشبینییەکی تەواو باڵی بەسەردا کێشاوە و بەخۆکوشتن دان بە تێکشکانی خۆیدا دێنیٚ.

ڕۆماننووسەکانیش ئەم دۆزەخە زەمینییانە دەقۆزنەوە، ئایا کۆمیدیای مرۆیی و رۆگۆن – ماکارت[٩١] دوو گەشتی نویٚ نەبوون بۆ دۆزەخ؟.

چۆن تووشی سەرسامبوون نایەین بۆ ئەم رووە لێکچوانەی نێوان خەیاڵی دانتی و جیهانێکی تەژی بە بوغزێکی قێزەون، بێزارکار و بیٚ-بەزەیی و گەشبۆوە بە ئازاری ئاوری دەروونە چاوچنۆکەکان، بە لێدانی بەرژەوەندیی تایبەتی و ئەنگێزە و ئاگری ستەمی کۆمەڵایەتی دەرەکی و هیچ و پووچی کەسانیتر، ئەم مەسەلانە بلزاک و زۆلا و رۆماننووسەکانیتر وێنای دەکەن بۆمان؟ لە رووسیا تۆڵستۆی و دیستۆفسکی دۆزەخە حەشاردراوەکەی بونیادی کۆمەڵایەتی و دڵی مرۆڤ راودەنێن: دۆزەخی هەژارەکان و دۆزەخی هوشیاری تاکەکەس و زیندانیی لەنێوان ئازاری ویژدان و نەبوونیدا. رۆمانی(وڕێنەکەرەکان)ی دیستۆفسکی وەک نموونە.

دۆزەخ لەو ساتەوەختەی بەرەو توانەوە دەچێت، دەبێتە پێویستیی، کە دەبیٚ بدۆزرێتەوە تەنانەت گەر بوونیشی نەبێت. ئەوە بڕوای

٩١ : کۆمەڵە رۆمانێکی ئەمیل زۆلان ژمارەیان ٢٠ رۆمانە و لەنێوان ساڵانی ١٨٧١ و ١٨٩٣دا بڵاوبوونەتەوە، کە مێژووی سروشتی و کۆمەڵایەتی خێزان لە سایەی ئیمپراتۆریەتی دووەمدا دەگێڕنەوە دەکاتەوە.

یاســــادانەران و دامەزرێنەرانـــــی دیکترینەکــــان و چــــاکخوازە کۆمەڵایەتییەکانە. دوای ئەوەی زۆرینەی یەعقوبییەکان[٩٢](جاکۆبییەکان) نکۆڵیان لێکرد، ناپلیۆن بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتەکەی بەکاری دێنێ:" ئەوانەی بە ئەرکـــی ئـــایینی هەڵناســـتن، ڕێنماییەکـــانی ئیمپراتـــۆریەت سـزایەکی هەتاهەتاییـان بـۆ ئامـادە دەکـات". لە سـەردەمی ریفۆرمـدا جۆزێـف لۆمیســتەر دەســت دەکـات بە بەرگـریکـردن لە دۆزەخێکـی خوێنـاوی، کە خواوەنـدی جەلاد فەرمـانڕەوایی دەکـا. مـارکیز دی سـاد زیاتر چەمکگەلە پەرۆشـەکەی بۆ خـوێن و ئـازار لەوەوە وەرگـرت، وەک لەوەی لە تیۆلـۆژی کاسـۆلیکی وەرگرتبێ، چەنـدە سـەیرە هەتـا ئێسـتاش لێی وەردەگیرێ.

لای پێکهێنەرانی کۆمەڵگە نوێکان پێویستبوون بە دۆزەخ بەڕوونی دیـارە، لای تۆباوییەکـانیش کە خەون بە جیهـانێکی باشـترەوە دەبیـنن هەروایە، تەنانەت لای بێباوەڕەکانیش. بەمجۆرە فەیلەسووفی داکۆکیکار لە پـۆزەتیڤیزم ئۆگەسـت کۆنـت، لەوەی کە پێـیدەڵێن(بڕیـاری کـۆمەڵگە) چـاوەڕێی شـتێ دەکـا هاوتـای ڕۆژی دوایـی تـایبەت و دۆزەخ بـێ،

٩٢:یەعقوبییەکان گرووپێکی سیاسی توندڕەو بوون لە فەرەنسا و خۆیان بە پشتیوانی شۆڕشی نوێی ئەو وڵاتە دادەنا، کە لە ساڵی ١٧٨٩وە کەوتنە جووڵە و لە ١٧٩٢/٩/٢ پەلاماری زیندانەکانی فەرەنسایان دا، بە پاساوی تۆڵەکردنەوە لە ناپاکەکانی شۆڕش ، دوای ساڵێک بەسەر ئەو کوشتارگەیەی لە زیندانەکاندا ئەنجامیان دا، لە پاریس کۆنگرەیەکی نیشتمانییان بەست و دەنگیان بەرزکردەوە، کە کاتی ئەوە هاتووە پیلانگێڕەکان لەناو بەرن، بەو جۆرە تۆقاندن و تیرۆریان کردە نێو ئەجێندای کارەکانیانەوە، بەو جۆرە لە ساڵی ١٧٩٣ یەعقوبییەکان لە فەرەنسا دەسەڵاتیان گرتەدەست بە سەرۆکایەتی(ماکسیمیلان رۆبسپێر) لە ڕێگەی توندوتیژییەکی ئاژاوەگێڕانەوە، خوێنێکی زۆر لە فەرەنسا ڕێژرا، هەر بەو بۆنەیەش خودی زاراوەی(تیرۆریست) بۆ یەکەمینجار بەرانبەر ماکسیمیلان و هاوەڵەکانی بەکار هێنرا. لەبەرئەوە مێژوونوسان سەرەتای سەردەمی تیرۆریزمی هاوچەرخ دەگێڕنەوە بۆ پاییزی ساڵی ١٧٩٣ کە فەرەنسای تەنیبۆوە.

ئەویش(بیابــانی غەزەب لــیٚگرتــوو)ە. دەرفەتمــان دەبــیٚ لە ریٚنمــاییە دانراوەکـان بخـویٚنینەوە کە" پـاش مـردن بە حەوت سـاڵ، کـاتیٚ هەمـوو ئــارەزووە ورووژیٚنەرەکــان نــامیٚنن، پــیٚشئەوەی ببیــتە باشــترین بەڵگەنامەیەکی تـایبەت کە بزر بووبیٚ، رۆژی دوایی تـایبەت دیٚت، لەویٚ رەگورِیشــەی برِیارەکـانی کـۆمەڵگە لەبرِیــاری خـوداییەوە ســەرچاوە دەگـرن، بـۆ دیـاریی‌کردنـی چارەنووسـی هەر مرۆڤیٚـک بەشـیٚوەیەک کە بـواری تانەلیٚـدانی تیٚـدا نەبیٚـت. هەموو(پیاوچاکـان) دەگـوازریٚنەوە(زۆنی مەدەنـی). "بەڵام لە بـارودۆخی نائاسـاییدا بـۆ کـارە قیٚـزەونە زەقەکـان، ســووکایەتییەکە لەویٚـدا ئاشـکرا دەبیٚـت، بـارە شـوومەکە بـۆ بیابـانی ئەفەرۆزەکان دەگوازنەوە، بۆ نیٚو ئازاردراوان و خۆکوژان و عاشقانی زۆرانبـازی". بـوونی بـوونەوەرگەلی شـەرِەنگیٚز لە تیٚرِوانینـی ئۆگەسـت کۆنت، پاساویٚکە بۆ چەمکی مەرگی هەتاهەتایی کە چەندە پیٚویستە. بەو جۆرە ئایینی پۆزەتیڤی جەخت لەسـەر بیرۆکەکەی فیورباخ دەکاتەوە کە دەڵـیٚ:" ئـایین دنیـابینیی خـۆی لەسـەر جیهـانی ئایـدیاڵی بـۆ ویٚنـاکردنی زەمینــی و رۆحــی دەگــوازیٚتەوە، پیٚویســتیش دەبــیٚ لەســەری، کە بەشیٚوەیەکی یەکلاکارانە شیٚوازیٚک بۆ رزگـاربوون لە خراپەکاران گەلاڵە بکات، کە مەحاڵە بهیٚنریٚنە سەر ریٚگەی راست".

رەنــگە لەبەرئەوەش بیٚــت کە رۆژیٚــک لە رۆژان، دۆزەخ مەشــخەڵیٚ نەبووە، هەروەک سەدەی نۆزدە، وەک ئەوەی شاردنەوەی لە دنیاکەی‌تر وای لـیٚکردبیٚت لەسـەر زەمـین بکشـیٚتەوە. سـەدەی بیسـتیش هەسـتا بە برەودان بەم بزاڤە.

**٤- دۆزەخی هاوچەرخ:**

لە تیٚرِوانینـی زۆر کەسـدا، سـەدەی بیسـت شـایانی نازنـاویٚکە کە زۆر ئیرەیی پـیٚنـابریٚ، ئەویش شۆرەتی(سـەدەی دۆزەخەکان)ـە بەهـۆی دوو

جەنگە جیهانییەکەی، جینۆساید و بۆمبی ئەتۆمی و چەکە کیمیاوییەکەی، خەڵکە برسییەکەی جیهانی سێ کە بێبەشە لە مامەڵەکردنی مرۆییانە، بێکارییەکەی، پیسبوونەکەی، رژێمە تۆتالیتارەکانی، دیموکراسیەتە گەندەڵەکەی، ژمارە زۆرەکەی دانیشتوانی، گرتووخانەکانی، خێوەتگەکانی دوورخستنەوە(گولاگ)، بەنگ و مادده هۆشبەرەکانی، نەخۆشی ئایدزی، چ سەدەیەک دەتوانێ کێبڕکێی لەگەڵدا بکات بۆ وەرگرتنی ئەم مەدالیا شەیتانییە. لە راستیدا دەکرێ کاری باشتر ئەنجام بدرێ، کە ئەمەیان سەدەی بیستویەک دەچێتە ژێر بارییەوە، بەڵام هەندێجار واقیع ئەو خەیاڵدانە دۆزەخییەش تێدەپەڕێنێ، کە لای رەبەنی سەدەکانی رابردوو درووست دەبوو: لای مۆریس کلاڤیل جیهانی هاوچەرخ سوورە لەسەر ئەوەی وێنەی دۆزەخی تەقلیدی بێنێتەوە پێشچاوان.

ئالان کە تەنیا هەستێکی پێشوەختەی لا گەڵاڵە بووە سەبارەت بە سەلیقەی سەردەمەکە، رای وایە کە مرۆڤایەتی لە سێیەمین قۆناغی دۆزەخدایە: دوای دۆزەخی هۆمیرۆس کە قەدەری دەرەکی دەستی تێوەردەدا، دۆزەخی ڤرجیل دێت کە بەرەنجامی قەدەری ناوخۆ بووە، ئەوجا دۆزەخی دانتی دێ، دۆزەخی بژاردەی ئازاد، دۆزەخی خۆئەشکەنجەدان.

شڵەژانگەلێ توند لەسەر ئاستی گۆی زەوی، پیاوانی هزری ناچار کرد زیاتر لە چەمکی دۆزەخ قووڵ ببنەوە، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیان دڵنیابەخش نەبوون: دۆزەخ لە بنەڕەتدا دۆخێکی مرۆیی و ژیانێکی دەستەکۆییە، بە دەربڕینێتر ئەوەیە هزرڤانانی هاوچەرخ بانگەشەی بۆ دەکەن، کە ئەنجامی تۆژینەوەکانیان زیاتر کامڵ دەبێ وەک لەوەی کورت بێنێ.

هەموو ئەوانە لە پەیوەندییەکانی نێوان من و ئەوانیتردا لە ئارادایە، دۆزەخی(من) تاک دەکریتەوە بۆ دڵنیابوون و بە حەسرەتەوە گۆشەگیرییە سەرەکییەکەی دێتەدی. مارساڵ جۆهاندۆ نووسیویەتی:" لەهەر شوێنێ بم ویستێکی ئازاد دەبێ، لەهەر شوێنێکیش ویستی ئازاد هەبێ، دۆزەخی رەها و هەتا هەتایی بەتوندی بوونی دەبێت". دۆزەخ تەواوکارێکە بۆ پەیوەندیکردنێکی زۆرەملێیانە بەوانیترەوە. شانۆگەرییەکەی سارتەر(دەرگای داخراو) دەربڕی هەموو دۆخە مرۆییەکەیە، تراژیدیای سێ کارەکتەرەکەیەتی: تۆ و من لەژێر چاودێری ئەو، بەو پێیەی کە بڕیارم لەسەر دراوە لەگەڵ ئەویتر بژیم، بەبێ ئەو و بێ چاودێری ئەو، بوونی من نییە، ناتوانم هیچ شتێک بکەم بۆ راست-کردنەوەی وێنەی خۆم، لە خودی خۆم هەڵبێم:" ئێستا ئەمە دۆزەخە، هەرگیز بڕوام نەدەکرد. وەبیرم دێتەوە: گۆگرد، تەختە، مەقەڵی(...) چ گاڵتەجاڕییەکە، پێویست بە مەقەڵی ناکات: دۆزەخ ئەوانیترە".

ئەمە قەلەقی وجودی دۆزەخییە، کە مارتین هایدگەر لەو کلۆڵییەدا دایدەنێ، توانەوەی (من) لە بێناوی(ئەو/یەکێکیان)دا دەیورووژێنێ. ئەم توانەوەیە "بەبێ دابڕان موچڕکەی دڵەڕاوکێ بەناو قەوارەی مرۆییدا دێنێ". دەرککردن بە گۆڕینی ئەم هەڵوێستە، ئازار و ئەشکەنجە چەند بەرابەر دەکاتەوە: لە پێناو ئەوانیتر و گەردووندا نامۆیانە دەژیم، فڕێدراو لە جیهانێک نە ئامانج و نە کۆتایی هەیە: لە تێڕوانینی کامۆوە ئەمە دۆزەخە.

دینۆ بەزاتی[٩٣] وەسفێکی دڵگیر بۆ سەردانێکی دۆزەخ دەنووسێ، لە کۆمەڵە چیرۆکێکیدا بەناونیشانی لۆ کا(Le K.) لەوێدا ماناکانی دانتی

---

٩٣ : رۆژنامەوان و چیرۆکنووسێکی بەناوبانگی ئیتالیایە لە ساڵی ١٩٧٢ لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا مردووە.

دووبـاره دەكـاتەوە، پـوختەكەی ئەوەیە رۆژنامەوانێـك لە شـاری میلانـۆ بەهـۆی تەكنۆلۆژیـایەكەوە دەروازەی شانشـینی شـەیتان دەدۆزێـتەوە: ئەوێ بریتییە لە شارێكی گەورە لەنێو ئاپۆرای ئۆتۆمبیلدا خنكاوە. ئەوە دۆزەخێكـی رۆژانەیە: ئازارەكـانی خەڵـك بە بەرچاومـدا گـوزەر دەكەن، دەمبینـین وتووێژیـان دەكـرد، دەلەرزیـن، قاقایـان لـێدەدا، دەوەسـتان، دەكەوتـن و دووبـاره هەڵدەسـتانەوە، دواتـر دەكەوتـنەوە، دەئـاخڤین، زەردەخەنـە لـێدەدەن، دەگـریین، جنێـو دەدەن، هەمووشـیان لەسـەر ئومێدی خولەكی داهاتوو وەستاون".

بەم تێـڕوانینە هـاوچەرخە مێـژووی دۆزەخ كڵـۆم دەدرێ، كە دوای دەورەیەكـی سـێ هەزار سـاڵی بـۆ چەمكەكـانی سـۆمەری دەگەڕێـتەوە: هەمـوو شـتێ لەم جیهـانەدا گەمە دەكـا. ئیپتـالۆ كاڵڤینـۆ لە(شـاره نەبینراوەكان)دا دەنووسێ:" دۆزەخی زیندووەكان نـایەت، گەر هەرشبێ ئەوا ئێرەیە، دۆزەخ ئەوەیە كە هەمـوو رۆژێـك تێیدا دەژیـین، ئەوەیە كە بەپێكەوەبوونمان دروستی دەكەین".

دۆزەخ هێنـدەی دێرینـی مرۆڤـایەتی كـۆنە، تـا ئەو كـاتەی مرۆڤـایەتی بمێنێـت دۆزەخـیش دەمێنێـت. بەڵام پرسـیارە كـۆنەكە كە لە سـەردەمی گلگـامش و ئەنكیـدۆوە بەبـێ وەڵام مـاوەتەوە و مـرۆڤ لەخـۆی دەكـات ئەوەیە: بۆچی؟.

# سەرچاوەکان

هەموو شارستانییەتێک سامانێ ئەدەبیی یەکجار گەورەی لەبارەی دۆزەخەوە هەیە، بەڵام لێرەدا تەنیا ئاماژە بە هەندێک کتێب دەدەین.

ج.هۆلان لە کتێبی(ڕووخساری شاراوەی کات) و (وێناکردنی جیهانەکەیتر) چاپی پاریس ساڵی ١٩٨٥، هەستاوە بە تۆژینەوەیەک بۆ واتای قووڵی خورافەکانی دۆزەخیی. کارەکانی ج.دۆلۆمۆ رۆشنایی خستۆتەسەر زۆر لە دیاردەکانی ترسان لەدۆزەخ. لە سەردەمی نوێ بەتایبەتی و تایبەتیتریش:( خەتا و ترس). (گوناهکاری لە رۆژاوا)(( سەدەی سیانزە- سەدەی هەژدە)) پاریس، فایار ١٩٨٣. لەسەر هەمان بابەت پی. کامپۆرازی( ترس لە دۆزەخ)ی نووسیوە لەگەڵ(وێناکردنەکانی رۆژی دوایی و رزگاربوون لە بەرەبەیانی ئەورووپای نوێ) وەرگێڕانی ئینگلیزی، کامبریدج، پۆلیتی پریس ١٩٩١. ج. لۆگۆف لە کتێبەکەی(لەدایکبوونی پاکژکار) پاریس-گالیمار ١٩٩١، رۆشنایی دەخاتەسەر زۆر رووی بیروباوەڕگەلی دۆزەخیی لە چاخەکانی ناوەڕاست، هەروەها ئەی.جی. بیکەر لە دانراوەکەیدا(بەشدارییەک لە تۆژینەوەی بەراوردکاری بۆ تێڕوانینی ئاسمان و دۆزەخ لە سەدەکانی ناوەڕاست) لەگەڵ وەرگرتنە تایبەتەکانی لە تێکستگەلێ ئینگلیزی، بالتیمۆر ١٩٨٨. جی. منیوا هەوڵی نووسینی دانراوێکی تەواوی داوە(مێژووی دۆزەخەکان) پاریس، فایار ١٩٩١.

دەکرێ ئاوڕیش لە تێڕوانینی تیۆلۆژی بدەینەوە سەبارەت بە بابەتی دۆزەخ لە (فەرهەنگی تیۆلۆژستی کاسۆلیکی) پاریس، لیتوازی ١٩١٣ کە زیاتر نوێگەری تێدا کراوە لە (فەرهەنگی تیۆلۆژستی کریستیانی) پاریس، دیلیە دویرویر ١٩٧٧. لەسەر (دۆزەخ) لە گرووپی(باوەڕی زیندوو)

پاریس ١٩٥٠ کارێکی دەستەکۆیی کراوە. کتێبێکە لە چەند وتارێک پێک-دێ، وەک وتــاری ج. گتیــۆن لەســەر(دۆزەخ لە چەمکــی هاوچەرخــدا)، وتاری م. کاروج(وێنەکانی دۆزەخ لە ئەدەب). وتاری ب. دوریڤال(دۆزەخ لە هونەردا) و ئەی. میشاڵ لە(مردنی رۆژی دوایی و ژیانەکەیتر) پاریس، بلودوگـای ١٩٢٩، بیرۆکەیەکی باشـە لەبـارەی گـوڵچنکردنی کۆتـایی بـۆ چەمکەکانی تیۆلۆژی لەسەرەتای سەدەی بیست سەبارەت بە دۆزەخ.

دەربـارەی شارسـتانییەتە کۆنەکـان، باشـترە کتێبی(ئـاینی ئەلۆمـانی کــۆن) پــاریس، پــایۆ ١٩٦٦ لە نووســینی ج. دومیزیــل بخــوێنرێتەوە. کتێبی(شامانی و تەکنیکە کۆنەکانی کێشکردن) پاریس، پایۆ چاپی دووەم ١٩٦٨ لە نووســینی ئــێم. ئیلیــاد لەگەڵ( ئاســمان و دۆزەخــی میســری) لەندەن ١٩٠٦ لە نووسینی بودج.

کتێبی(ڕووخســارە تەقلیـدییەکانی دۆزەخ) لەنـدەن ١٩٠٣ لە نووسـینی جــی. میــو. کتێبــی(رێگەیەک بــۆ دۆزەخ) و (تــۆژینەوەیەک لە چەمکــی مردووەکان لە ئەدەبی نەرویژی کۆن) کامبریدج ١٩٤٣ لە نووسینی ئێچ. ئاڕ. ئەلیس.

ئەوەشی پەیوەستە بە پەیمانی کۆن:

کتێبی(چەمکـی سـەرەتایی مـردن و جیهـانەکەیتـر لە پەیمـانی کـۆن) بیبلیا و ئۆرینتالا، رۆما ١٩٦٠ لە نووسینی ئێن. جی. ترۆمپ.

سەبارەت بە جیهانی ئیسلامی:

س. ئەلسالّح(ژیانی داهاتوو بە پێی قورئان) پاریس ١٩٧١.

دەربارەی دیاردە فۆلکلۆرییەکانیش:

کتێبـی (فۆلکلـۆر لە فەرەنسـا) و (زەوی و ژێـر زەوی) پـاریس ١٩٠٤-١٩٠٦ لە نووسینی پی. سیبیلۆ.